زنجیرەی بڵاوکراوەکانی گۆڤاری ئاسۆی پەروەردەیی - ٢٨ -






# فەرهەنگی

# زاراوەکانی دەنگسازی

## ئینگلیزی- عەرەبی- کوردی

د. تالیب حوسێن عەلی

کوردستان ــــــــــــــــــــ هەولێر

* ناوی کتێب : فه‌رهه‌نگی زاراوه‌کانی ده‌نگسازی
ئینگلیزی ـ کوردی
*دانه‌ر : د. تالیب حوسێن عه‌لی
* له زنجیره بلاوکراوه‌کانی گۆڤاری ئاسۆی په‌روه‌رده‌یی ژماره ( ٢٨ )
* پیت چنین و نه‌خشه‌سازی : کۆمپیوته‌ری ده‌ریا
*تیراژ : ( ٥٠٠ ) دانه
* چاپی یه‌که‌م ـ هه‌ولێر ـ ٢٠٠٥
* ژماره‌ی سپاردن ( ١١٩ )ی ساڵی ٢٠٠٥

# پێشەکی

فەرهەنگ ئەو سەرچاوەیەیە یان ئەو کتێبەیە کەزانیاری تایبەتی تێدا تۆمار دەکرێت دەربارەی وشەو زاراوەکانی زمان و واتاکانیان. دیارە فەرهەنگیش جۆری زۆرە، ئەم کارەش کە کۆمەڵێ زاراوە بەخۆیەوە دەگرێت، وەك فەرهەنگێکی زانستی تایبەتە بەو زاراوانەی کە لەبواری دەنگسازیدا بەکاردێن.

– ئامادەکردنی ئەم کۆمەڵە زاراوەیەش لەبواری دەنگسازیدا دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێك لەخوارەوە بەکورتی ئاماژەیان بۆ دەکەین:

١–لەڕاستیدا کوردی– نەك تەنیا لەم زانستەدا– بەڵکو لەزۆربەی زانستەکانی تردا پێویستیەکی زۆری بەم جۆرە فەرهەنگە زانستیانە هەیە. ئەم هۆکارەش زیاتر هانی دام –کە ماوەیەکی زۆرە کاری تێدا دەکەم– ئەم بەرهەمە بچوکە بخەمە بەر دەستی خوێنەری بەڕێز بەئومێدی ئەوەی ببێتە هەوێنی کارێکی گەورەو فراوانتر بۆ ئامادەکردنی فەرهەنگێکی تایبەت لەبواری دەنگسازیو زمانەوانیدا.

٢–بۆ ئەوەی خوێنەری کورد ئاشنابێت بەو زاراوانەی کە تایبەتن بەم زانستە، دیارە لەم ڕووەوە تاکو ئێستا شتێکی ئەوتۆ ئامادە نەکراوە، ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە توێژەر یان خوێنەر زیاتر خۆی بەزاراوە جیهانییەکە ببەستێتەوە بێ ئەوەی بە تەواوی مەبەستەکەی لا ڕوون بێتەوە.

٣-نوسینەوەی هەر باسێك لەم بوارەدا بەزمانی کوردی، نوسەر دووچاری کێشەی وەگێڕانی زاراوە دەبێت، بۆ ئەوەی زاراوەیەکی کوردی بەرامبەر بەزاراوە جیهانییەکە دابنێت، ئەمەش زۆرجار دەبێتە هۆی ئەوەی کەچەند زاراوەیەك بۆ هەمان زاراوە جیهانییەکە بەکار بهێنێت.

ئەگەرچی لێرەدا هەوڵ دراوە بەرامبەر بەهەر زاراوەیەك زاراوەیەکی کوردی دابنرێت کە مەبەستی زاراوە جیهانییەکە بگەیەنێت، ئەگینا ناچار بووینە کە زاراوەکە بکەین بەکوردیو بەکاربهێنین، هەروەها واتاو مەبەستی زانستی زاراوەکە بەکورتی خراوەتە ڕوو، لەهەر شوێنێکیشدا کەپێویستی کردبێت نموونەمان بەزمانی کوردی بۆ هێناوەتەوە.

بێگومان لەم کارەدا سود لەچەند سەرچاوەیەك وەرگیراوە، بەپلەی یەکەم لەفەرهەنگی (معجم علم اللغة النظري) کە لەکۆتایی فەرهەنگەکەدا بەپێی ئەلفۆبێی ناوی دانەرەکانیان ڕیزکراون.

دوا وتەم ئەوەیە کە بڵێم: ئەم فەرهەنگە یەکەم فەرهەنگی زانستی کوردییە لەبواری زانستی زماندا دەخرێتە بەر دەستی خوێنەری کوردەوە بێ کەم و کوڕی نییە، بۆیە لێرەدا بەهەستێکی زانستییەوە داوا لەپسپۆڕو شارەزایانی زمان دەکەم. ئاگادارمان بکەنەوە لەهەر ناتەواویو کەم و کوڕیەك کە بەرچاویان دەکەوێت بەتایبەتی لەبەکارهێنانی زاراوە کوردییەکاندا کەسود بەم کارەو زاراوە سازی کوردی بگەیەنێت، پڕ بەدڵ سوپاسی هاوکاریتان دەکەم، ئەگەر بەوشەیەکیش بێت کە خزمەتی زمانەکە بکات.

# -A-

| | | |
|---|---|---|
| ablaut | إبدال الصائت | **گۆڕانی ڤاوڵ:**<br>بریتیە لە گۆڕینی ڤاوڵێک بەڤاوڵێکی تر لەناوەندی وشەیەکدا کە دەبێتە هۆی گۆڕانی واتای وشەکە، ئەم دیاردەیە بەزۆری لەزمانە هیندو ئەوروپییەکاندا ڕوودەدات، وەکو ژیر: ژێر، هەروەها ئەم جۆرە گۆڕانە بە apophony یان vowel gradation ناو دەبرێت. |
| abnormal vowel | صائت شاذ | **ڤاولی ناوێزە:**<br>ئەو ڤاوڵەیە کە دەکەوێتە نێوان ڤاوڵێکی پێشەوەو ڤاولی دواوە. |
| absorption | امتصاص | **قوتدان ( هەڵمژین )**<br>وەك زاراوەیەك بۆ دوو مەبەست بەکاردێت:<br>أ- تێکەڵ کردنی دەنگێك لەگەڵ دەنگێکی تردا -پێش یان پاش- دەنگەکە.<br>ب-جۆرێکە لە گونجانی دوو دەنگ کە لەکاتی گۆکردندا یەکێکیان لەناو دەچێت، وەکو: لەگەڵت دێم > لەگەڵدێم. |
| accent | النبرة | - ئەم زاراوەیە بۆ ئەم مەبەستانە بەکاردێت:<br>أ-**هێز:**<br>بڕوانە زاراوەی stress<br>ب-نیشانەی هێز لەنووسیندا<br>ج-شێوەی ئاخاوتنی کەسێك کە جیایی دەکاتەوە لەئاخاوتنی کەسێکی تر. |
| Accommoda-tion | المماثلة الجزئية | **گونجانی ناتەواو:**<br>جۆرێکە لەگۆڕانی دەنگ کە ئاکارێك (سیفەتێك) لەدەنگەکە دەگۆڕێت بۆ ئەوەی |

| | | |
|---|---|---|
| | | لەگـــەڵ دەنگـــە کارتێکردووەکـــەدا جـــۆرە گونجانێك پەیدا ببێـت وەك گـۆڕانی /ش/ ی کپ بۆ /ژ/ی گڕ بۆ ئەوەی لەگەڵ /ن/ی گڕدا بگونجێت، بۆ نموونە:<br>پاش+ نوێژ > پاژنوێژ |
| acoustic Phonetics | علم الاصوات الاكوستيكي | **فۆنەتیکی ئەکۆستیکی:**<br>لقێکـــە لەزانســـتی دەنـــگ بایـــەخ بـــە دیراســـەکردنی تایبەتییـــەکانی مـــاددی (فیزیکـی) دەنگـەکانی زمـان دەدات لـەکاتی گواستنەوەی ئەو دەنگانـە لەقسـە کـەرەوە بـۆ گوێی گوێگر، هەندێ زمانەوان بـە فۆنـەتیکی فیزیکی physical phonetics ناوی دەبن. |
| acoustics | علم الاكوستيكي | **زانستی ئەکۆستیکی دەنگ:**<br>ئـــەو زانســـتەیە کـــە لەتایبەتییـــەکانی گواسـتنەوەی دەنگـەکانی زمـان دەکۆڵێتـەوە بەتایبـەتی ئـەوەی کـە پەیوەنـدی بەلایـەنی مـاددی دەنگەکانـەوە هەیـە لـەکاتی دروسـت بـــوون و گواســـتنەوەی ئـــەو دەنگانـــە لەقسەکەرەوە بۆ بیسەر، ئەمـەش دوو لایـەنی گرنگ دەگرێتەوە:<br>أ-لایەنی فیزیکی دەنگەکان.<br>ب-لایەنی فیسیۆلۆجی ئەوەی کەپەیوەندی بەپرۆسەی بیستنەوە هەیە. |
| acrology = acrophony | كتابة صوتية اوائلية | **ئەکرۆفۆنی ( نووسینی سەرەتایی دەنگ ):**<br>ئـەو نووسـینە سـەرەتاییە بـوو کـە وەکـو نیشـانە (وێنـە) بـەکار دەهـات بـۆ ئـەوەی گوزارشـت لـەبیرێك یـان شـتێك بکـات، پاشـان ئـەو نیشـانەیە پـەرەی سـەندو بـەکارهات بـۆ |

| | | |
|---|---|---|
| | | دەنگی یەکەمی ئەو وشەیەی کە گوزارشت لەشتەکە دەکات. |
| active articulator | ناطق نشيط | **درکێنەری چالاك:** ئەو ئەندامە چالاکەیە لەئەندامانی ئاخاوتندا کە لەکاتی دوواندا بەرەو سازگەی دروست بوونی دەنگەکە دەجوولێتەوە، وەکو زمان و لێوی خواروو. |
| active cavity | تجويف نشيط | **بۆشایی چالاك:** ئەو بۆشاییەیە کە ڕاستەوخۆ بەشداری لەدرکاندنی دەنگێك دەکات وەکو بۆشایی ناو زار لەکاتی درکاندنی /س/، هەروەها بۆشایی ناو لووت لەکاتی درکاندنی /ن/. |
| actualization | تحقيق الصوت | **بەدی هێنانی دەنگ:** بریتییە لەدرکاندنی ڕاستەقینە فۆنیم کە لەژینگەیەکەوە بۆ ژینگەیەکی تر درکاندنی فۆنیمە کە دەگۆڕێت، وەك درکاندنی /ت/ لەسەرەتاو کۆتایی وشەدا: تەم،هات |
| acute | عالي التردد | **لەرەلەری بەرز:** ئەو دەنگەی کە لەرەلەرێکی بەرزی هەیە، وێنەی لەرەلەرەکەش لەئامێری سەبکتۆگرافدا دەردەکەوێت بۆ نموونە: /ب/، /پ/، /ف/ لەگەڵ ڤاوڵەکانی /ە/، /ی/، /یٚ/ لەرەلەرێکی بەرزیان هەیە، کە لەرەلەرەی نزم grave بەرامبەری دەوەستێت. |
| acute accent | نبرة رئيسية (حادة) | **هێزی سەرەکی (تیژ):** بڕوانە زاراوەی primary stress. |

| | | |
|---|---|---|
| Adam's apple | تقاحة آدم (الحنجرة) | **سێوی ئادەم (قورگ):**<br>ئەنـدامێکی درکاندنـە کەژێیـەکانی قـورگی تێدایە، هەروەها پێی دەوترێت Larynx یان voice box. |
| adaptation | تطويع، مماثلة | **گۆڕانی دەنگ، گونجان:**<br>بۆ دوو مەبەست بەکاردێت:<br>**أ-گۆڕانی دەنگ:** واتـە گـۆڕینی دەنگـی وشـەی خوازراو (بێگانە) بۆ ئەوەی لەگەڵ فۆنـەتیکی دەنگـەکانی زمانـە خوازراوەکـەدا بگونجێـت، وەك: ظالم- زاڵم، طائرة- تەیارە.<br>**ب-گونجان:**<br>بڕوانە زاراوەی assimilation. |
| adjacent sound | صوت مجاور | **دەنگی دەوروبەر (دراوسێ):**<br>أ-دوو دەنگ لەوشەیەکدا ببن بەدراوسێ.<br>ب-دوو دەنـــگ لـــەڕووی ســـازگەوە بـــبن بەدراوسـێ، واتـە نزیـك بوونـەوەی سـازگەی دەنگێك لەسازگەی دەنگێکی تر. |
| advanced = fronted | مقدم | **پێشکەوتوو (دەنگ):**<br>ئەو دەنگەی کە لەشوێنی درکانـدنی ئاسـایی خۆیـدا نامێنێـتو دێتـە پێشـەوە لەئـەنجامی کـارتێکردنی دەنگـی دەوروبـەر لـەناو هـەمان وشـــەدا، واتـــە ســـازگەی دەنگەکـــە پـــێش دەکەوێت، وەك درکاندنی /ك/ لەوشەی (کێ)دا. |
| affricate | مزجي (شبة انفجاري) | **تێکەلاو (نیمچە گیر):**<br>دەنگێکـی لێکـدراوە لـەدوو دەنـگ پێـك دێـت، یەکـــەمیان گـــیرەو ئـــەوی تریـــان خشـــۆکە، بەگیرەکـە دەسـت پـێ دەکـات و بەخشـۆکەکە |

| | | |
|---|---|---|
| | | تەواو دەبێت، بۆیە بەدەنگێکی لێکدراو یان نیمچە گیر ناو دەبرێت، سازگەی درکاندنی ئەم دەنگە دەکەوێتە نێوان پووکی ددان و مەلاشوی رەقەوە. لەکوردیدا دوو فۆنیمی تێکەلاو هەیە، یەکەمیان /ج/یە کە دەنگێکی تێکەلاوی پووکە مەلاشویی گرە، دووەمیان /چ/یە کەدەنگێکی تێکەلاوی پووکە مەلاشویی کپە. |
| affricated stop | انفجاري مزجي | **گیری تێکەلاو:**<br>بڕوانە: زاراوەی affricate |
| affrication | مزج | **تێکەڵ:**<br>بریتییە لەبەدوایەك هاتنی دەنگێکی گیر لەگەڵ دەنگێکی خشۆك بۆ دروست بوونی دەنگێکی تێکەڵ، وەکو /چ/ لەوشەی (چاو)دا. |
| air chamber | تجويف هوائي | **بۆشایی هەوا:**<br>ئەو بۆشاییانەی ناو ئەندامانی ئاخاوتن دەگرێتەوە کە پەیوەندییان بەپرۆسەی درکاندن و دروست بوونی دەنگەکانی زمانەوە هەیە. ئەوانەش لەچوار بۆشایی پێك دێن:<br>١-بۆشایی سییەکان. ٢-بۆشایی قورگ<br>٣-بۆشایی زار (دەم). ٤-بۆشایی لووت |
| air stream | مجرى النفس | **ڕێڕەوی هەناسە:**<br>ئەو ڕێڕەوەیە کە تەزووی هەناسەی بەناودا دەڕوات وەکو بۆری هەناسەو قورگ و گەروو زار و لووت. |

| | | |
|---|---|---|
| allochrone | الوكرون<br>متغير زمني | **ئەلۆ گرۆن:**<br>بریتیە لەجیاوازی درێژە پێدانی درکاندنی دەنگ لەوشەدا، بێ ئەوەی کار لەواتای وشەکە بکات، بۆ نموونە وشەی (دوور) بەدرێژە پێدان و کورت کردنەوەی ڤاوڵەکە دەدرکێت بێ ئەوەی کار بکاتە سەر واتای وشەکە. |
| allograph | الوغراف،<br>متغير حرفي | **ئەلۆگراف (شێوەی نووسینی پیت):**<br>شێوەیەکە لەشێوەکانی نووسینەوەی پیتێک و لەشوێنێکی تایبەتیدا بەکاردێت، بۆ نموونە نووسینی پیتی (بێ)ی سەرەتایی و (بێ)ی ناوەڕاست و کۆتایی بەم شێوە جیاوازانە دەنووسرێت: (بـ، ـبـ، ب). |
| allophone | ألوفون،<br>متغير صوتي | **ئەلۆفۆن (شێوەکانی دەنگ):**<br>شێوەیەکە لەشێوەکانی درکاندنی هەمان فۆنیم، بێ ئەوەی درکاندنی ئەو شێوە جیاوازە کار لەواتای وشە بکات. واتە ئەو کۆمەڵە دەنگەیە کەفۆنیمێک دەیان گرێتە خۆیەوەو بەئەندامێکی یان ئەلۆفۆنی ئەو فۆنیمە دادەنرێن وەك گۆکردنی /ت/ لەم وشانەدا بەشێوەی جیاواز: تەڕ- تەمەن- تاڵ- گرت. |
| allophonic | تغير الوفوني | **گۆڕانی ئەلۆفۆنی:**<br>گۆڕانی درکاندنی فۆنیمێك بێ ئەوەی کار لەواتای وشەکە بکات. وەکو درکاندنی /س/ لەوشەی (سەوزە)ی کوردیدا چ بە (س) یان (ص) گۆبکرێت واتای وشەکە ناگۆڕێت. |

| | | |
|---|---|---|
| alphabet | الألفبا | **ئەلفوبێ:**<br>بریتیە لەهێماکانی نووسینی پیتی کە زمانی پێ دەنووسرێتەوە. |
| alphabetical notation | كتابة الفبائية | **نووسینی ئەلفوبێی:**<br>ئەو نووسینەیە کە بۆ هەر دەنگێکی زمانی هێماکانی نووسینی تایبەتی بۆ دادەنرێت، واتــە هــەر فۆنیمێــك بــەگرافیمێك نیشــان دەدرێــت ئــەم جــۆرە نووســینە تارادەیــە لەنووسینی کوردیدا پەیڕەو دەکرێت. |
| alveola | اللثة، السنخ | **پووك:**<br>لێوارێکی شێوە قۆقزە لەناو زاردا، دەکەوێتـە پـاش دانـەکانی سـەرووی پێشـەوە، دەبێتـە سازگە بۆ ژمارەیەکی زۆری دەنگـەکان، وەکـو /س/، /ت/، /د/ |
| alveolar | لثوي | **پووکی ( دەنگ ):**<br>ئــەو دەنگەیــە کــە لەئــەنجامی لێکــەوتنی (تمــاس) نــووکی زمــان لــەپووکی پــاش دانەکانی سەرووی پێشەوە دروست دەبێت، وەك: /س، ز، ل، ن، ر، ت، د/. |
| alveolar ridge | اللثة | **پووك:**<br>بڕوانە: زاراوەی alveola. |
| alveo palatal | غاري لثوي | **پووکە مەلاشوویی ڕەق:**<br>ئـەو دەنگەیـە کـە لەئـەنجامی لێکـەوتنی یـان نزیــك بــوونی پێشــەوەو ناوەڕاســتی زمــان لـەپووك و مەلاشـوویی ڕەق دروسـت دەبێـت، وەکو:<br>/ژ/، /ش/، /ج/، /چ/، /ی نیمچە ڤاوڵ/ |

| | | |
|---|---|---|
| ambisyllabic consonant | صامت ثنائي المقطع | **كۆنسنەنتی دوو بڕگەیی:** ئەو دەنگە کۆنسنەنتەی کە دەکەوێتە نێوان دوو ڤاوڵەوە، هەروەها بەشداری لەهەردوو بڕگەی پێش و پاشەوە دەکات، واتە بڕگەی یەکەم و دووەمی وشەکە، وەکو /ل/ لەوشەی (کەللە و زللە)دا هەیە |
| amplificative | متعلق بالتضخيم | **پەیوەندی بە قەڵەوبوونی دەنگەوە هەیە:** |
| amplitude | سعة | **فراوانی:** بریتیە لەگەورەترین لادانی تەنی لەراو لەخاڵی سرەوتنیەوە. کەپێوانەی ڕادەی جوڵە لە لەرەیەکدا نیشان دەدات. |
| analphabetic notation | كتابة غير هجائية | **نووسینی ناهیجائی:** جۆرە هێمایەکی نووسینە کەپیتەکانی ئەلفوبێی ئاسایی تێدا بەکار نایەت وەکو نووسینی بڕگەیی و نووسینی وشەیی. |
| anaptyctic sound | صوت مقحم | **دەنگی زیادکراو:** ئەو دەنگەیە کە لەناوەندی وشەیەکدا یان ڕستەدا زیاد دەکرێت بەمەبەستی ئاسانی گۆکردن، وەکو زیادکردنی /ی/ نیمچە ڤاوڵ لەوشەی مامۆستا+ ان > مامۆستایان |
| anaptyctic vowel | صائت مقحم | **ڤاوڵی زیادکراو:** ئەو ڤاوڵەیە کە لەنێوان دوو کۆنسنەنتی وشەیەکدا زیاد دەکرێت بۆ ئەوەی گۆکردنی وشەکە ئاسان بێت، لەزمانی کوردیدا بە زۆری نیمچە ڤاوڵی /ی، و/ ئەم ڕۆڵە دەبینن. |
| antevior = diffuse | أمامي، متقدم في مخرجه | **پێشەوە، پێشکەوتوو لەسازگەدا:** سیفەتە بۆ ئەو دەنگە کۆنسنەنتەی کە |

| | | |
|---|---|---|
| | | لەکاتی درکاندنیدا تەزووی هەناسە رێی لێ دەگیرێت لەلێوو ددانو پووكو مەلاشوی رەقدا، وەکو /ت/، /ن/، /ب/، واتە ئەم سیفەتە کۆنسنەنتە لێویەکان و ددانیەکان و پووکییەکان و مەلاشوی رەق دەگرێتەوە، کە دەکەونە بەشی پێشەوەی ئەندامانی ئاخاوتنەوە. |
| anthro pophonics | الإمكانية الصوتية البشرية | **تواناى دەنگى مرۆڤ:** بریتیە لەتواناى تەواوى ئەندامانى ئاخاوتن لای مرۆڤ بۆ درکاندنی دەنگەکانی زمان. |
| anticipation | توقع | **روودانی پێش وەخت:** بریتیە لەگۆڕانی درکاندنی دەنگێك بە دەنگێکی پاش خۆی لەئەنجامی ئامادەبوونی ئەندامانی ئاخاوتن بۆ درکاندنی دەنگی پاشەوە (دووەم)، واتە ئامادەبوونی ئەندامەکان پێش وەخت دەبێتە هۆی گۆڕانی درکاندنی دەنگی یەکەم بۆ ئەوەی لەدرکاندنی دەنگی دووەم بچێت وەکو: سەرت داگرە > سەردداگرە لێرەدا /ت/ بە /د/ گۆڕاوە |
| anticipation assimilation | مماثلة توقعية | **گونجانی پێش وەخت:** بریتیە لەگۆڕانی دەنگێك بۆ ئەوەی لەگەڵ دەنگێکی پاش خۆیەوە بگونجێت وەکو: لەگەڵت دێم > لەگەڵددێم. |
| aperture | انفتاح | **کرانەوە:** بریتیە لەپلەی کرانەوەی ئەندامانی ئاخاوتن لەکاتی درکاندنی ئەو دەنگانەی کەگیر (وەستاو) نین، ئەمەش بەرامبەر بە داخستن closure دەوەستێت. |

| | | |
|---|---|---|
| apex | الذلق، رأس اللسان | **نووکی ( سەری ) زمان :**<br>بریتیە لەبەشی پێشەوەی (نووکی) زمان، وەکو درکێنەرێك دەجوولێتەوەو نزیك دەبێت لەدانەکانی سەروو یان پووك یان مەلاشووی ڕەق بۆ دروست کردنی ئەو دەنگانەی کە بەنووکە زمانی apical ناو دەبرێن. |
| aphaeresis | ترخيم استهلالي | **لەناوچوونی سەرەتایی:**<br>بریتیە لە لەناوچوونی دەنگێك یان زیاتر لەسەرەتای وشەیەك یان مۆرفیمێکدا، بەزۆری دەنگە لەناوچووەکە دەنگێکی ڤاوڵ دەبێت کە دەکەوێتە ژێر کاریگەری ڤاوڵی کۆتایی وشەیەکی ترەوە، وەك لەناوچوونی /ـە/ لەسەرەتای مۆرفیمی ناسیاری (ە کە) لەوشەی چرا+ ەکە > چراکە |
| aphesis | ترخيم استهلالي صائتي | **لەناوچوونی ڤاوڵی سەرەتایی :**<br>بریتیە لە لەناوچوونی ئەو ڤاوڵەی کەهێزی لەسەر نییە لەسەرەتای وشەدا. |
| apical | ذلقي | **نووکە زمانی ( دەنگ ):**<br>أ-ئەو دەنگەیە کە نووکی زمان بەشداری لەدرکاندنی دەکات، وەکو /ت/ کە لەئەنجامی لێکەوتنی یان نزیك بوونەوەی نووکی زمان لەدانەکانی سەروو دروست دەبێت.<br>ب-سیفەتە بۆ دەنگی نووکە زمانە. |
| apico | ذلقي | **نووکە زمانی:**<br>پێشگرێکە وەسفی ئەو دەنگە دەکات کە نووکە زمانییە. |
| apico-alveolar | لثوي ذلقي | **پووکی نووکە زمانی :**<br>ئەو دەنگەیە کە سازگەکەی پووکی ددانەو |

| | | |
|---|---|---|
| | | درکێنەرەکەشی نووکی زمانە، کاتیٚ کە نووکی زمان لەپووکی دانەکانی سەروو نزیك دەبێت یان لێی دەکەوێت، وەکو درکاندنی /س، ز، ن، ل، ر/. |
| apico-alveolar fricative | احتكاكي لثوي ذلقي | **خشۆکی پووکی نووکە زمانی:** ئەو دەنگەیە کەشێوەی درکاندنی خشۆکییەو سازگەکەی پووکی ددانەو درکێنەرەکەشی نووکی زمانە وەکو /س، ز/ |
| apocopation | ترخيم ختامي | **لەناوچوونی ( سووان ) کۆتایی:** بریتیە لەسووانی دەنگێك یان زیاتر لەکۆتایی وشەیەکدا وەکو: هەندێك > هەندیٚ دەخوات > دەخوا |
| apophony | ابدال الصوائت | **گۆرانی ڤاولْ:** بریتیە لەگۆڕینی ڤاوڵێك لەوشەیەکدا بە مەبەستی دروست کردنی وشەیەکی تری نویٚ، وەکو: بەر: بار: بۆر: بیر گۆڕینی ڤاولی ئەو وشانە بۆتە هۆی گۆڕینی واتاکانیان، بڕوانە زاراوەی ablaut. |
| archiphoneme | فونيم شامل ( الأم ) | **فۆنیمی سەرەکی ( بنجی ):** ئەو فۆنیمە سەرەکییەیە کە چەند شێوەیەکی درکاندنی جیاوازی هەیە، ئەو جۆرە جیاوازییەش نابێتە هۆی گۆڕینی واتا، وەکو /لْ/ لەکوردیدا لەهەندیٚ ناوچە بە [ر] دەدرکێت، مالْ > مار. |
| articulation | نطق | **درکاندن:** بریتیە لە گۆکردنی (بەرهەمهێنانی) ڕاستەقینەی دەنگەکانی زمان لەکاتی ئاخاوتندا یان لەکاتی خوێندنەوە بەدەنگێکی بەرز. |

| | | |
|---|---|---|
| articulator | ناطق | **دركێنەر:**<br>هەر ئەندامێكی ئاخاوتن لەكاتی دركاندنی دەنگەكانی زماندا بەرەو سازگەی دروست بوونی دەنگەكە بجولێتەوە، وەكو زمان و لێوی خواروو. |
| articulatory phonetics | علم الاصوات النطقي | **فۆنەتیكی دركاندن:**<br>بەشێكە لەزانستی دەنگ كەلەپرۆسەی بەرهەمهێنانی دەنگەكانی زمان دەكۆڵێتەوە،واتە لەشێوەی دركاندنی دەنگەكان و سازگەی دركاندن و ئەو ئەندامانەی كە بەشداری لە دركاندنی دەنگەكان دەكەن، هەندێ بە فۆنەتیكی فیسیۆلۆجی physiological phonetics ناوی دەبەن. |
| articulatory system | جهاز النطق | **كۆئەندامی دركاندن:**<br>ئەو ئەندامانەی لەش كە بەشداری لەدركاندنی دەنگەكانی زمان دەكەن، وەكو سییەكان و بۆری هەناسەو قورگ و گەروو ژێیەكانی قورگ و زمانۆچكەو مەلاشوو پوكی ددان و زمان و لێوەكان و لووت. |
| artificial palate | حنك اصطناعي | **مەلاشوی دروستكراو:**<br>مەلاشوویەكی دروست كراوە بۆ روون كردنەوەو دیاریكردنی سازگەی دەنگەكانی زمان بەكاردێت. |
| ascending diphthong | ثنائي صائت صاعد | **ڤاوڵی دوولانەی بەرز:**<br>ئەو ڤاوڵە دوولانەیەیە كەبەرزی دەنگەكە دەكەوێتە كۆتاییەوە، هەروەها بە rising diphthong ناو دەبرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| aspirate | هائي، نفسي<br><br>صوت هائي | **هائی، هەناسەدار:**<br>١-ئـەوەی کـە دەنگێکـی زمـانی دەکاتـە هەناسەدار یان هائی.<br>٢-سـیفەتە بـۆ ئـەو دەنگـەی کـە دەنگێکـی وەکـو هـائی لەگەڵـدا دەردەچێت لەئـەنجامی درکانـدنی بـەهێزی دەنگەکـە کـە تـەزووی هەناسەیەکی توندی لەگەڵدا دێتە دەرەوە.<br>٣-دەنگی هائی:<br>ئـەو دەنگەیـە کـە دەنگێکـی هـائی لەگەڵـدا دەردەچێت، بـەزۆری دەنگـی گـیری کـپ کـە لەسەرەتای وشەوە دەردەکەوێت وەکـو (تـەڕ، پـەڕ، کـەڕ) سـیفەتی هـائی لەگەڵـدا دەبێـت، بـەڵام کـە لـەپاش /س/دا دەردەکـەوێت وەکـو (دەست، ئەسپ، نیسك) سیفەتی هائییەکەی لەدەست دەدات. |
| assibilant | مزجي اسناني | **تێکەڵاوی ددانی (دەنگ):**<br>ئەو دەنگەیە کەشێوەی درکاندنی تێکـەڵاوەو شـوێنی درکاندنیشـی دانەکانـە، بڕوانـە dental affricate. |
| assimilation | مماثلة | **گونجان:**<br>بریتیـە لـەگۆڕانی دەنگێـك بـۆ ئـەوەی لـەدەنگێکی دەوروبـەری خـۆی بچێت وەکـو حەڤـدە > حەڤڤـە لـەزاری سلێمانیدا کـە /د/ گـۆڕاوە بـە /ڤ/ واتـە وەکـو /ڤ/ کارتێکردووەکـەی لێ هـاتووە، هـۆی ڕوودانـی ئـەم دیاردەیـەش دەگەڕێتـەوە بـۆ بارودۆخی ئەنـدامانی ئاخـاوتن و ڕێکخسـتن و گونجـانی |

| | | |
|---|---|---|
| | | جوولاًنەوەی ماسولکەکان لەکاتی درکانـدنی دەنگەکانـــدا. گونجـــانیش دوو جـــۆرە: گونجانی تەواوو گونجانی ناتەواو. |
| assimilatory sound | صوت مكيف | **دەنگی کارتێکردوو:**<br>ئەو دەنگەیە کە کار لەدەنگێکی تر دەکات و دەی گۆڕێت بۆ ئەوەی لەخۆی بچێت، وەکو بـۆت دێـنم > بـۆد دێـنم لێـرەدا /د/ کـاری کردۆتە سەر /ت/و گۆڕیویەتی بە /د/. |
| assonance | تجانس صوتي (سجع) | **گونجانی دەنگی (سەروا):**<br>بریتیـە لـە دووبـارە بوونـەوەی هـەمان دەنـگ لەو وشانەی کە لە وتەیەکدا بەرەو دوای یەك دێن، وەکو دووبـارەبونی/ـە/ لـەم نیـوە دێـرە شیعرەدا: بە ئاسمانەوە ئەستێرەم دیوە. |
| asyllabic | صوت غير مقطعي | **دەنگی نابڕگەیی:**<br>ئـەو دەنگەیـە کـە بەتـەنیا ناتوانێـت بڕگەیـەك پێك بهێنێت، هەروەها نابێتە ناوکی بڕگەش. |
| asymmetric | جانبي (صوت) | **لایی (دەنگ):**<br>ئـەو دەنگەیـــە کـــە بـــە هـــەردوولای زمانـــەوە گۆدەکرێت وەکو دەنگی لامـی سـوك و قەڵـەو لەزمانی کوردیدا. |
| atonic | مقطع غير منبور<br>غير منبور | **أ-بڕگەی بێ هێز:**<br>ئەو بڕگەیەی کە هێزێکی لاواز وەردەگرێت.<br>**ب-بێ هێز**<br>سیفەتە بۆ ئـەو بڕگەیـەی کـە هێزێکـی لاوازی هەیە. |

| | | |
|---|---|---|
| audible | مسموع | **بیستراو:**<br>سیفەتە بۆ ئەو دەنگەی یان ئاخاوتنەی کە بە ئاسانی دەبیسترێ. |
| auditory masking | تشویش سمعي | **تەشویشی بیستن:**<br>ئەو دەنگەی کە دەبێتە هۆی تێکدانی یان رێگە نەدان بە بیستنی دەنگێکی تر |
| auditory phonetics | علم الاصوات السمعي | **فۆنەتیکی بیستن:**<br>لقێکە لە زانستی دەنگ بایەخ بە دیراسە کردنی کۆئەندامی بیستن و پرۆسەی بیستن دەدات، هەروەها لە چۆنیەتی پێشوازی کردنی دەنگەکانی زمان و هەست کردن بەو دەنگانە دەکۆڵێتەوە. |
| autonomus phoneme | فونیم مستقل | **فۆنیمی سەربەخۆ:**<br>فۆنیمێکی پێوانەیی رووتە کە لەکاتی درکاندنی ڕاسەقینە دا بەچەند شێوەیەك دەدرکێت، هەرشێوەیەکیش لەوشێوانە پێی دەوترێت ئەلۆفۆن. |
| avulsive | شهیقي | **هەناسەیی ( هەناسەوەرگرتن ):**<br>ئەو جۆرە دەنگەیە کە لەهەندێ زمانە ئەفریقیەکاندا بەهۆی وەرگرتنی هەناسەوە پەیدا دەبێت، ئەمەش بەپێچەوانەی زۆربەی دەنگەکانی زمانە، کە بەهۆی هەناسەدانەوە دروست دەبن. |

# -B-

| | | |
|---|---|---|
| back of the tongue | مؤخر اللسان | **پشتەوەی زمان:**<br>ئەو بەشەیە لە زمان کە دەکەوێتە نێوان ناوەڕاستی زمان و ڕەگی زمانەوە، لەکاتی لێکەوتنی ئەم بەشە بە مەڵاشوی نەرمەوە /ك، گ/ دروست دەبێت، هەروەها پێی دوترێت -dorsum-. |
| back vowel | صائت خلفي | **ڤاوڵی پاشەوە:**<br>ئەو ڤاوڵانەیە کە بە بەشی پشتەوەی زمان دروست دەبن وەکو /و،وو،ۆ/ |
| basic consonants | صوامت اساسية | **کۆنسنەنتە سەرەکییەکان:**<br>ئەو کۆنسنەنتانەی کە لە زۆربەی زمانەکاندا هەیە، وەکو کۆنسنەنتە گیرەکانی /ب، پ، ت، د، ك، گ/ لووتیەکان /م، ن/ |
| bilabial | شفتاني | **لێوی (دەنگ):**<br>أ- ئەو دەنگەیە کە هەردوو لێو بەشداری لە درکاندنی دەکات، لێوی خواروو دەبێتە درکێنەر و لێوی سەرووش دەبێتە سازگەی درکاندن وەکو /م، ب، پ/<br>ب- سیفەتە بۆ ئەو جۆرە دەنگە. |
| bilbial nasal | انفي شفتاني | **لێوی لووتی (دەنگ):**<br>ئەو دەنگەیە کە زرینگانەوەی لەناو لووتدا دەبێت، لێوی خواروو وەك درکێنەر و لێوی سەروو وەك سازگەی درکاندن بەشداری لە درکاندنی دەنگەکە دەکەن، وەکو/م/ |
| bilabial stop | انفجاري شفتاني | **لێوی گیر (دەنگ):**<br>ئەو دەنگە گیرەیە کەهەردوو لێو بەشداری لە درکاندنی دەکەن، دەنگەکەش یان گڕدەبێت |

| | | |
|---|---|---|
| | | وەکو /ب/ یان کپ دەبێت وەکو /پ/. |
| bilabiodental | اسناني شفتاني | **لێو ددانی ( دەنگ ):** ئەو دەنگەیە کە بەنزیك بوونەوەی یان بەلێکەوتنی لێوی خواروو بە لێوی سەروو دانەکانی سەروو دروست دەبێت. |
| bilateral opposition | تقابل ثنائي | **جووتۆکەی بەرامبەری:** دوو فۆنیم لەتاکە سفەتێکدا بەرامبەر بەیەك بوەستن، وەکو لەم جووتە فۆنیمانەدا دەردەکەوێت: /د: ت/، /ب:پ/، /ز: س/، /ژ: ش/ ئەو جووتە فۆنیمانە لەهەموو سفەتێکدا وەکو یەکن، تەنیا لەسیفەتی گڕیو کپیدا نەبێت بەرامبەر بەیەك دەوەستن کە فۆنیمەکانی لای ڕاست لەو جووتە فۆنیمانەدا گڕن و ئەوانەی لای چەپیش کپن. |
| bilateral sound | صوت جانباني | **دەنگی دوولایی:** ئەو دەنگەیە کە لەکاتی درکاندنیدا تەزووی هەناسە لەهەردوو لای زاراوە دەردەچێت، وەکو /ل/ لەهەندێ زماندا، بەڵام کە تەزووەکە لەلایەکەوە دەربچێت ئەوا دەنگەکە بەدەنگی یەك لایی -lateral- ناودەبرێت. |
| binarism | تقسیم ثنائي | **دابەشکردنی دوویی ( جووت ):** بریتیە لەدابەشکردنی جۆرو یەکەکانی زمان |

| | | |
|---|---|---|
| | | بۆ دوو بەش، وەکو دابەشکردنی دەنگەکانی زمان بۆ کۆنسنەنت و ڤاوڵ، هەروەها بۆ گڕو کپ، یان دابەشکردنی ڤاوڵەکان بۆ کورت و درێژ، خڕو ناخڕ، سادەو لێکدراو..هتد. |
| blade of the tongue | مقدم اللسان | **پێشەوەی زمان:**<br>ئەو بەشەیە لەزمان کە دەکەوێتە نێوان نووکی زمان و ناوەڕاستی زمانەوە بەشەکانی زمانیش بریتیە لەنووک (apex)، پێشەوە (blade) ناوەڕاست (center)، پشتەوە (dorsum)، ڕەگ (root) هەروەها پێشەوەی زمان پێی دەوترێت (front of the tonque). |
| blocked syllable | مقطع مغلق | **بڕگەی داخراو:**<br>ئەو بڕگەیەیە کە بەدەنگێکی کۆنسنەنت کۆتایی دێت وەکو:<br>کوڕ، شەم، ژان |
| blocked vowel | صائت مقيد | **ڤاوڵی بەندکراو:**<br>ئەو ڤاوڵەیە کە دەکەوێتە نێوان دوو دەنگی کۆنسنەنتەوە وەکو ڤاوڵی /ی/ لەوشەی (پیر)دا. |
| breath group | مجموعة النفس | **کۆمەڵەی هەناسە:**<br>بریتیە لەزنجیرە دەنگێکی زمانی کە لەکاتی ئاخاوتنی ئاساییدا بەرەو دوای یەك دێن، لەپێش و پاش زنجیرە دەنگەکەش پرۆسەی هەناسە وەرگرتن ئەنجام دەدرێت. |
| breath stream | تيار النفس | **تەزووی هەناسە:**<br>بریتیە لەو تەوژمە هەوایەی کە لەکاتی هەناسەداندا لەسییەکانەوە دێتە دەرەوە، حوکم کردن (کۆنترۆڵ کردنی) بەسەر هەواکەدا دەبێتە هۆی دروست بوونی |

| | | |
|---|---|---|
| | | چەندین جۆری جیاواز لەدەنگەکانی زمان، بۆ نموونە گرتنی تەزووی هەناسەو پاشان بەرەڵاکردنی دەبێتە هۆی دروست بوونی دەنگی گیر (وەستاو)، یان ڕێگەدان بەتێپەڕبوونی تەنیا بەناو لووتدا ئەوا دەنگەکە دەبێتە دەنگێکی لووتی. |
| breathy phonation | نطق نفسي | **درکاندنی هەناسەدار:** ئەو جۆرە درکاندنەیە کە لەگەڵیدا -بەڕادەیەکی زۆر- ڕێگە بەهەناسە دەدرێت بۆ ئەوەی بەژێیەکانی قوڕگدا تێ بپەڕێت، ئەمەش بەرامبەر بەدرکاندنی تەنگ tight phonation دەوەستێت. |
| breathed segment | | **یەکەی (کەرتی) هەناسەدان:** بچووکترین یەکەی دەنگە کە بەکرانەوەی ژێیەکانی قوڕگ دەدرکێت. |
| breve | علامة قصر | **نیشانەی کورتی:** ئەو نیشانەیەیە کە لەسەر ڤاوڵ دادەنرێت و گوزارشت لەکورتی ڤاوڵەکە دەکات، بەم شێوەیە [ ]. دەنووسرێت. |
| bridge sound | صوت وصلي | **دەنگی گەیەنەر:** ئەو دەنگەیە کە لەنێوان ڕەگی وشەو پاشگرەکەیدا دەردەکەوێت بەمەبەستی ئاسانی درکاندن وەکو [y] کانی+ەکە > کانی یەکە. |
| bridge syllable | مقطع وصلي | **بڕگەی گەێنەر:** ئەو بڕگەیەیە کە لەنێوان ڕەگی وشەو پاشگرەکەیدا زیاد دەکرێت بە مەبەستی ئاسانی درکاندن. |
| bright vowel | صائت امامي | **ڤاوڵی پێشەوە:** بڕوانە front vowel. |

| | | |
|---|---|---|
| broad consonant | صامت واسع | **كۆنسنەنتی فراوان:**<br>ئەو دەنگە كۆنسنەنتەیە كە دەكەوێتە پێش یـان پـاش ڤـاوڵێكی فراوانــەوە، مەبەســت لـەڤاوڵی فـراوان ڤـاوڵی پشـتەوەیە، بڕوانــە back vowel. |
| broad transcription | كتابـــــة عريضة | **نووسینی فراوان:**<br>ئـەو جـۆرە نووسـینەیە كـە تـەنیا هێماكـانی فــۆنیمی تێــدا بــەكار دێــت، بــێ ئــەوەی سیماكانی دەنگی –نائەركی– بۆ دابنرێت، ئەمــەش بەرامبــەر بەنووســینی وردەكــاری norrow transcription دەوەســتێت. بــۆ نموونە نووسینی وشـەی (تـەم) بـەم شێوەیە /تــەم/ بـە نووسـینێكی فـراوان دادەنـدرێت، بەڵام كە بەم شێوەیە /تـّـەم/ بنوسرێت ئەوا گوزارشت لـە سیفەتی هائیـەتی /ت/ دەكات، ئەمـــەش بـــە نووســـینێكی وردەكـــاری دادەنرێت. |
| broad vowel | صائت واسع | **ڤاوڵی فراوان:**<br>بڕوانە ڤاوڵی پاشەوە back vowel. |
| buccal | فمي | **زاری (دەنگ):**<br>آ–ئـەو دەنگەیـە كـە تـەنیا لـە بۆشـایی نـاو زارەوە دەدركێـــت، وەكـــو /ت، د، ك، گ، ز، س/<br>ب– سیفەتە بۆ زار یان دەنگە زارییەكان. |
| buccal cavity | التجويـــــف الفمي | **بۆشایی ناوزار:**<br>یەكێكـە لـەو بۆشـاییانەی كـە بەشـداری لـە دروســت بــوونی دەنگــەكانی زمــان دەكــات، هەروەها پێی دەووترێت –oral cavity–. |

# - C -

| | | |
|---|---|---|
| cacophony | تنافر صوتي | **دوور کەوتنەوەی دەنگ:** بریتیە لە بەدوا یەکهاتنی دەنگەکانی زمان و تەتەڵەکردنی زمان لە گۆکردنیان بە هۆی دووبارە کردنەوەی دەنگەکان یان نزیک بوونی سازگەی ئەو دەنگانە لە یەکترەوە، وەکو: مەکتەب، مەتکەب. |
| cacuminal | ارتدادي | **هەلگەڕاوەیی ( دەنگ ):** ئەو دەنگە کۆنسنەنتەیە کە لەکاتی درکاندنیدا نوکی زمان بەرەو مەلاشوی ڕەق هەڵدەگەڕێتەوە وەکو /د/ لە هەندێ زمانە هیندیەکاندا لەگەڵ /ر/ ئەمریکی، بڕوانە —retroflex— |
| cadence | ايقاع | **ترپە:** بریتیە لەو شەپۆلانەی کە لە دەنگەکانی زماندا ڕوودەدات لە ئەنجامی بەدوایەکهاتنی برگەی هێزدار و برگەی بێ هێز لەو زمانانەی کە سیستەمی هێزی تێدا بەکاردێت، بڕوانە —rhythm— |
| caducous sound | صوت متساقط | **دەنگی کەوتوو ( لەناوچوو ):** ئەو دەنگەیە کە دەشێ لەکاتی ئاخاوتندا لابرێت و گۆنەکرێت، وەکو: هەندێك، هەندێ، دەبات، دەبا |
| cardinal vowels | الصوائت الرئيسية | **ڤاوڵە سەرەکییەکان ( ڤاولی پێوانە ):** بریتیە لە کۆمەڵە ڤاوڵێکی پێوانەیی گشتی، نادرێنە پاڵ هیچ زمانێکەوە، بەهۆی ئەم |

| | | |
|---|---|---|
| | | ڤاولأنەوە دەتوانین ڤاوڵەکانی هەر زمانێك -کە بمانەوێ دیراسەی بکەین- دەست نیشان بکەین. (دانیال جۆنز) ئەم ڤاولأنەی لە سیستەمێکی نەگۆڕدا بەپێی مەودای گشتیو جۆری ڤاوڵەکانی لە چەند خاڵێکی چەسپاودا دیاری کردووە.کە لە (٨) ڤاوڵی سەرەکی و چەند ڤاوڵێکی نا سەرەکیدا لەسەر بنەمای سیستەمێکی گشتی دەنگسازی بنیادنراوە. واتە ئەم ڤاولأنە لە ڕووی ژمارەو جۆری نووسین و ڕێکخستنیان سیفەتێکی جیهانیان وەرگرتووە. |
| cavity = chamber | تجويف | **بۆشایی:**<br>ئەو شوێنە فراوانەیە لەناو ئەندامانی ئاخاوتندا کە لەگەڵ دەنگە زمانییەکەدا زرینگانەوەی تێدا ڕوودەدات، هەروەها تەزووی هەناسە بەناویدا تێدەپەڕێت. لەناو ئەندامانی ئاخاوتندا چوار بۆشایی هەیە بریتین لەمانەی خوارەوە: بۆشایی سییەکان- بۆشایی قوڕگ- بۆشایی زار- بۆشایی لووت. |
| central vowel | صائت مركزي | **ڤاوڵی ناوەندی:**<br>ئەو ڤاوڵەیە کە لەکاتی درکاندنیدا بەرزترین بەش لەزمان لەناوەندی زار ڕادەوەستێت، لەزمانی کوردیدا دوو ڤاوڵی ناوەندی هەیە ئەویش /ە، ا/یە. |
| centrodomal | غاري وسطي | **مەلأشویی ناوەڕاست (دەنگ):**<br>ئەو دەنگەیە کە لەکاتی درکاندنیدا بەشی |

| | | |
|---|---|---|
| | | ناوەڕاستی زمان لەگەڵ مەلاشووی ڕەقدا لێك ـحەكەون یان لێك نزیك دەبنەوە وەكو /چ، ژ، ی نیمچە ڤاول/. |
| checked syllable | مقطع مغلق | **بڕگەی داخراو:**<br>ئەو بڕگەیەیە كە بەدەنگێكی كۆنسنەنت یان زیاتر كۆتایی دێت، ئەمەش بەرامبەر بە بڕگەی كراوە دەوەستێت، وەكو: سەر، دەست. |
| chest pulse | نبضة صدرية | **لێدانی سنگ:**<br>بریتییە لەگرژبوون و هاتنەوەیەكی ماسوولكەكانی سنگ و ناو پەنچك كە دەبێتە هۆی دەركردنی هەوا لەسییەكانەوە. هەندێ زمانەوان لەو باوەڕەدان كە لەگەڵ هەر گرژبوونەوەیەكدا ئەو تەوژمە هەناسەیەی كە دێتە دەرەوە بڕگەیەكی زمانی دروست دەبێت. |
| chromatic accent | نغم | **ئاوازە:**<br>بڕوانە: زاراوەی pitch. |
| chrone | كرون، وحدة زمنية | **كرۆن، یەكەی كاتی:**<br>یەكەیەكی كاتییە ماوەی بەردەوامی دەنگە زمانییەكە دەردەخات، بڕوانە chroneme. |
| chroneme | كرونيم، فونيم كمي | **كرۆنیم:**<br>بریتییە لەماوەی یان ڕادەی بەردەوام بوونی دركاندنی دەنگی زمانی ئەمەش ڕەنگە ببێتە هۆی جیاوازی لەواتادا، بۆ نموونە /و/ لەوشەی (كوڕ)دا كەماوەی دركاندنی |

| | | |
|---|---|---|
| | | فۆنیمەکـە درێـژ بکەینـەوە دەبێتـە (کـووپ)، واتە بووە هۆی گۆڕانی مانای وشەکە. |
| circumflex accent | نبرة منحنية | **هێزی چەماوە ( نیشانە ):** آ-نیشانەیەکی هێڵییە لەسـەر هەنـدێ ڤـاوڵ دادەنرێت بۆ ئـەوەی درێـژی ڤاوڵەکە نیشان بدات، وەکو (تیـ ^ ڤ). ب-نیشـانەیەکی هێڵییـە بـەم شـێوەیە /^/ دەنووسرێت کە گوزارشت لـەهێزی لاوەکـی دەکات، واتـە ئـەو هێـزی کە بەپلـەی دووەم دێت. |
| clearL | لام مرققة | **لامی سووك ( دەنگ ):** دەنگێکی لایی سووکە لەکوردیدا لەسەرەتای وشـەو پـێش ڤـاوڵ دەکـەوێت وەکـو /ل/ لـە وشەی (لێو)دا بەپێچەوانەی لامی قەڵەو کە لەسەرەتای وشەدا دەرناکەوێت. |
| clear lateral | جانبي مرقق | **لایی سووك ( دەنگ ):** بریتیــە لــەدەنگی لامــی ســووك بڕوانــە clearL. |
| clear sound | صوت حاد | **دەنگی تیژ:** ئەو ڤاوڵەیـە کـە پلـەی لەرینەوەکـەی بـەرزە، وەکـو لەڤاوڵـەکانی پێشـەوە /ی، یٚ/دا بـەدی دەکرێت. |
| close approximant | احتكاكي | **خشۆکی ( دەنگ ):** بڕوانە زاراوەی fricative. |
| closed stress | نبرة مغلقة | **هێزی داخراو:** ئــەو هێزەیــە کــە دەنگــە کۆنســـەنەنتەکەی لەگەڵدا دەبیستین، لەکاتێکدا دەنگە ڤاوڵەکە لەو پەڕی بەهێزی خۆیەتی. |

| | | |
|---|---|---|
| closed syllable | مقطع مغلق | **برگەی داخراو:**<br>ئەو برگەیەیە کە بە کۆنسنەنتێك یان زیاتر کۆتایی دێت، ئەمەش بەرامبەر بە برگەی کراوە دەوەستێت کە بە ڤاوڵ کۆتایی دێت. |
| close juncture | فاصل مغلق | **هەڵوەستەی داخراو:**<br>بریتییە لە گواستنەوەی بەردەوام لە دەنگێکەوە بۆ دەنگێکی تر بێ دابڕان لە دەربڕینی وتەیەکدا. |
| close vowel | صائت ضيق | **ڤاوڵی تەسك (دەنگ):**<br>ئەو ڤاوڵەیە کە لەکاتی درکاندنیدا زمان بەرادەیەکی تەواو بەرز دەبێتەوە بەرەو مەلاشوو، زاریش بە ڕادەیەکی کەم لەگەڵیدا دەکرێتەوە وەکو /ی/، /وو/، هەروەها بەڤاولی بەرز high vowel ناو دەبرێت و ڤاوڵی کراوەش open vowel بەرامبەری دەوەستێت. |
| closure | اغلاق | **داخستن:**<br>بریتیە لە ڕاگرتنی تەزووی هەناسە لە کاتی درکاندنی دەنگێکی گیردا. داخستنەکەش بە هۆی هەردوو لێو دەبێت وەکو لە درکاندنی/ب، پ/ دا ڕوو دەدات، یان بەهۆی نووکی زمان و پوکی دان دەبێت وەکو لە درکاندنی /د، ت/ دا ڕوو دەدات،یان بە هۆی پشتەوەی زمان و مەلاشوی نەرم دەبێت وەکو لە درکاندنی /گ، ك/ دا ڕوو دەدات. |

| | | |
|---|---|---|
| cluster | عنقود صوتي | **هێشووە دەنگ:** بریتیە لە دەرکەوتنی دوو کۆنسنەنت یان زیاتر بەدوای یەکدا لە بڕگەیەکدا، وەکو /شت/ لە وشەی (دەشت)دا |
| coalescence | صائت ثنائي | **ڤاوڵی دوو لانە:** ئەو دەنگەیە کە لە ئاکامی لێکدانی یان تێکەڵبوونی دوو ڤاوڵ دروست دەبێت بۆ ئەوەی دەنگێکی یەکگرتوو پێک بهێنن لەکوردیدا بە ڤاوڵێك و نیمچە ڤاوڵ دروست دەبێت، وەکو /وێ/ لەوشەی (شوێن) بڕوانە: diphthong. |
| coalescent assimilation | مماثلة تبادلية | **گونجانی ئاڵوگۆڕ:** بڕوانە: reciprocal assimilation. |
| coarticulated stop | انفجاري ثنائي | **گیری دوولانە ( دەنگ ):** ئەو دەنگە گیرەیە کەزار لەگەڵ درکاندنیدا لەیەك کاتدا دووجار دادەخرێت. |
| co-articulation | نطق مصاحب | **درکاندنی دوولانە:** ئەو دەنگەیە کە لەکاتی درکاندنیدا دوو سیفەتی دەنگی جیاواز یان زیاتری لەگەڵدا دەردەکەوێت، وەکو /م/ کە سیفەتی لووتی و لێوی بەخۆیەوە دەگرێت. |
| coda | تقفيلة | **کۆتایی بڕگە ( داخستن ):** بریتیە لەکۆتایی ئەو بڕگەیەی کە دەکەوێتە نێوان ناوکی بڕگەکەو سەرەتای بڕگەیەکی نوێ، وەکو /ت/ لەوشەی (لووتکە)دا. |
| combinatory phonetics | علم الاصوات المتصلة | **فۆنەتیکی ئاخاوتنی بەردەوام:** ئەو زانستەیە کە دیراسەی دەنگەکانی زمان |

| | | |
|---|---|---|
| | | دەکات لەسیاقی ئاخاوتنی بەردەوامدا لەگەڵ ئەو کاریگەرییەی کە سیاقەکە دەیکاتە سەر سروشتی دەنگەکان. |
| comparative phonetics | علم الاصوات المقارن | **فۆنەتیکی بەراورد:** ئەو زانستەیە کە دیراسەی دەنگەکانی دوو زمان یان چەند زمانێکی سەر بەیەك کۆمەڵە خێزانی زمانی دەکات. |
| complementary distribution | توزیع تکاملي | **دابەشبوونی تەواوکەری:** بریتیە لەدابەشبوونی شێوە جیاکانی هەمان کەرەسەی زمانی بەسەر ئەو شوێنانەی کەتێیدا دەردەکەون بەمەرجێك هیچ یەکێك لەو شێوە جیایانە لەشوێنی ئەوی تریاندا دەرنەکەوێت، بۆ نموونە دەرکەوتنی ئەلۆفۆنەکانی /ت/ لەسەرەتاو ناوەندو کۆتایی وشەدا بەم شێوەیە دابەش دەبن: لەسەرەتا وەك (تەم) [ت] هائی دەبێت. [ت] ناهائی لەدوای /س/ دەبێت وەك (مەستم) (ستون)، [ت] بەندکراو لەکۆتایی دەبێت وەك (هات). |
| complex nucleus | نواة مركبة | **ناوکی لێکدراو:** ئەو برگەیەی کە ناوکەکەی (لووتکەکەی) لەهێشووە ڤاوڵ یان لەڤاوڵێك و نیمچە ڤاوڵێك پێك دێت، لەکوردیدا برگە نییە لووتکەکەی هێشووە ڤاوڵ بێت. هەروەها بە complex peak ناو دەبرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| complex wave | موجة مركبة | **شه پۆلی لێکدراو:**<br>ئەو شەپۆلەیە کە لەدوو شەپۆلی دەنگی لێکدراو پێك دێت. |
| compound grapheme | حرف مركب | **گرافیمی ( پیتی ) لێکدراو:**<br>دوو پیت گوزارشت لەدەنگێك بکەن، وەکو <ph> کە گوزارشت لە [f] دەکەن لەوشەی (photo)ی ئینگلیزیدا. |
| compound phoneme | فونيم مركب | **فۆنیمی لێکدراو:**<br>ئەو فۆنیمەیە کە لەدوو فۆنیمی سادە پێك دێت، وەکو ڤاوڵی دوولانەی /iy/ لەوشەی (meet)ی ئینگلیزیدا، هەروەها فۆنیمی تێکەڵاوی /چ/ کە لە (د، ژ) پەیدا دەبێت. |
| concrete sound | صوت محسوس | **دەنگی هەست پێکراو:**<br>ئەو دەنگە زمانییەیە کە بەفیعلی لەئاخاوتنی ئاساییدا دەدرکێت، کە دەنگی رووت (مجرد) واتە فۆنیم بەرامبەری دەوەستێت. |
| conditioned change | تغير مشرط | **گۆڕانی بەمەرج- ( مەرجدار ):**<br>بریتیە لەگۆڕانی فۆنیمێك بۆ فۆنیمێکی تر بەهۆی کارتێکردنی ئەو ژینگە دەنگییەی کە لەدەوروبەریدا هەیە. |
| conditioned stress | نبرة مشرطة | **هێزی بەمەرج ( مەرجدار ):**<br>ئەو بڕگەیەیە کە دەکەوێتە ژێر بارێکی ئەرکی یان مۆرفیمی یان دەنگییەوە. |
| conditioned variant | متغير مشرط | **گۆڕاوی بەرمەرج ( مەرجدار ):**<br>هەر ئەلۆفۆنێك یان ئەلۆمۆرفێك شێوەی دیاری کراو وەردەگرن لەدابەش بوونیاندا، |

| | | |
|---|---|---|
| | | ولته بەپێی ئەو شوێنە تایبەتییەی کەتێیدا حەردەکەون، ئەلۆفۆنێکی تریان ئەلۆمۆرفێکی تری تێیدا دەرناکەوێت وەکو [ت] هائی کە مەرجی دەرکەوتنی دەبێ لەسەرەتای وشەدا بێت، هەروەها بەگۆڕاوی شوێنیش positional variant ناو دەبرێت. |
| conditioniny | اشراط | **مەرجداری:**<br>وەك زاراوەیەك بۆ ئەم مەبەستانە بەکاردێت:<br>آ-ئەوەیە کە دروست بوون و ڕوودانی یەکەیەکی زمانی ببەسترێتەوە بەڕوودانی یەکەیەکی تری پێش یان پاش خۆیەوە.<br>ب-ئەوەیە کەڕوودانی (دروست بوونی) یەکەیەکی زمانی بەندبێت بەشوێنی سەرەتایی یان ناوەندیی یان کۆتایی دەرکەوتنی یەکە زمانییەکە. |
| conditiong sound | صوت مكيف | **دەنگی ڕاهاتوو (گونجاو):**<br>ئەو دەنگەیە کەدەبێتە هۆی گۆڕانی دەنگێکی تر بێ ئەوەی گۆڕانەکە کار لەخۆی بکات، بۆ نموونە وشەی پاش+ نوێژ > پاژنوێژ. لێرەدا /ن/ی گڕ کاری کردۆتە سەر /ش/ی کپ و گۆڕیویەتی بە /ژ/ی گڕ. |
| connecting consonant | صامت رابط | **کۆنسنەنتی لکاندن:**<br>ئەو دەنگە کۆنسنەنتەیە کە ئەرکی ئاسان کاری دەبینێ لەکاتی لێکدانی (لکاندنی) دوو مۆرفیم لەچوارچێوەی وشەیەکدا وەکو /ت/ کۆنسنەنت لەوشەی هاتوو+ەوە > هاتۆتەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| connecting vowel | صائت رابط | **ڤاوڵی لکاندن:**<br>ئەو دەنگە ڤاوڵەیە کە دەبێتە هۆی لێکدانی (لکانــدنی) دوو مــۆرفیم لــە وشــەیەکدا، بێگومان ڤاوڵەکە دەچێتە نێوان ڕەگی وشەو پاشــگرەکە یــان لــەنێوان دوو وشــەدا دەردەکەوێت بۆ دروست کردنی وشەیەکی لێکدراو بۆ نموونە:<br>کانی+ەکە > کانی یەکە /ی/ نیمچە ڤاولْ<br>گولْ+ گەنم > گوڵە گەنم /ە/ ڤاولْ. |
| consonance | سجع الصوامت | **دووبارەبوونی کۆنسنەنت:**<br>بریتیــە لــەدووبارە بوونــەوەی هــەمان کۆنسـنەنت لـەکۆتایی ئـەو وشـانەی کـەدوا بەدوا یەك دێن وەکو دووبارە بوونی /ت/ لـەم ڕستەیەدا: خەبات ماست دەخوات. |
| consonant | صامت | **١-کۆنسنەنت ( نەبزوێن ) ( دەنگ ):**<br>ئـەو دەنگەیـە کـە سـازگەیەکی دیـاریکراوی هەیــە لەگــەڵ درکێنــەرێکی دیــاریکراودا، هــەروەها لــەکاتی درکاندنیــدا جــۆرە تەکەرەیەك یان داخستن و کرانەوە دەخرێتە بەر تەزووی هەناسەوە. دەنگی کۆنسنەنتش لەبارەی چۆنیەتی درکاندنیەوە یان گیرە یان خشۆکە یان تێکەڵاوە یان لووتییە یان لاییە یان زرینکاوە بەڵام لەڕووی سازگەی دروست بوونییەوە یـان قورگییـە یـان گەروییـە یـان مەڵاشـویی نەرمـە یـان مەڵاشویی ڕەقـە یـان پووکییـە یـان ددانییـە یـان لێوییـە، بـەڵام لــەبارەی درکێنــەری کۆنســنەنتەوە یــان |

| | | |
|---|---|---|
| | حرف صامت | پشتەوەی زمانە یان ناوەڕاستی زمانە یان پێشەوەی زمانە یان نووکی زمانە یان لێوی خوارەوەیە.<br>**٢- پیتی کۆنسنەنت:**<br>هەر پیتێك کەببێتە هێما یان نیشانە بۆ دەنگی کۆنسنەنت، هەندێ بەپیتی نەبزوێن ناوی دەبەن. |
| consonantal | صامتي | **کۆنسنەنتی:**<br>ئەوەی کە پەیوەندی بەدەنگی کۆنسنەنت یان پیتی کۆنسنەنتەوە هەیە. |
| consonantal digraph | ثنائي صامت | **کۆنسنەنتی دوو پیتی:**<br>دوو پیتی کۆنسنەنت بەسەر یەکەوە وەك نیشانەیەك لەنووسیندا بەکاربێت بۆ دەنگێکی کۆنسنەنت وەکو (ch)و (ph) لەئینگلیزیدا بۆ /چ/ و /ف/ بەکاردێن ئەمەش لە کوردیدا نییە کە دوو پیت وەك نیشانەیەك بۆ تاکە دەنگێك بەکاربێت. |
| consonantal lenghth | طول الصامت | **درێژی کۆنسنەنت:**<br>بریتیە لەماوەی بەردەوام بوونی درکاندنی دەنگی کۆنسنەنت، لەوانەیە درێژی کۆنسنەنت لەهەندێ زماندا ئەرکی فۆنیم ببینێ و لەهەندێکی تردا ئەو ئەرکە نەبینێ، واتە ئەگەر ماوەی درکاندنی کۆنسنەنتەکە درێژ بکرێتەوە ئەوا لەهەندێ زماندا واتای وشەکە دەگۆڕێت بەلام لەکوردیدا درێژی کۆنسنەنت ئەرکی فۆنیم نابینێ چونکە |

| | | |
|---|---|---|
| | | نابێته هۆی گۆڕینی واتای وشه. |
| consonantal trigraph | ثلاثي صامت | **کۆنسنەنتی سێ پیتی:** بریتیه لەکۆبوونەوەی سێ پیتی کۆنسنەنت بەسەر یەکەوە وەك نیشانەیەکی نووسین بەکاربێن بۆ یەك دەنگی کۆنسنەنت، ئەم جۆرە نیشانەیە لەنووسینی کوردیدا نییە. |
| consonantal writing | کتابة صامتية | **نووسینی کۆنسنەنتی:** ئەو نووسینەیە کە کۆنسنەنتی تێدا دەنووسرێت و ڤاوڵە کورتەکانیشی تێدا دەرناکەوێت، وەکو لەنووسینی زمانی عەرەبیدا بەرچاو دەکەوێت کاتێ کە سەروبۆرو ژێری بۆ دانانرێت. |
| consonant cluster | عنقود صامت | **هێشووە کۆنسنەنت:** بریتیە لەدەرکەوتنی دوو کۆنسنەنت یان زیاتر لەبڕگەیەکدا بەسەر یەکەوە وەکو (شت) لەوشەی (هەشت)دا. |
| consonant group | مجموع صامت | **کۆمەڵە کۆنسنەنت:** بریتیە لەدەرکەوتنی چەند کۆنسنەنتێك بەسەر یەکەوە لەبڕگەیەکدا. |
| consonant-ization | التحويل الى صامت | **بە کۆنسنەنت کردن:** واتە گۆڕینی ڤاوڵێك یان نیمچە ڤاوڵێك بۆ کۆنسنەنت. |
| constituent | مكون | **پێکهێن:** ئەوەیە کە هەر یەکەیەکی زمانی بەشێکی بچووك پێك بهێنێ لەیەکەیەکی گەورەتردا، وەکو فۆنیم کە لەگەڵ فۆنیمەکانی تردا |

| | | |
|---|---|---|
| | | مۆرفیمێك پێك بهێنن. |
| contact anticipation | مماثلة مباشرة | **گونجانی ڕاستەوخۆ:** ئەوەیە کە دەنگێکی زمانی کار بکاتە سەر دەنگێکی تر لەپاش خۆیەوە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ، ئەمەش دەبێتە هۆی گۆڕانی دەنگەکە بۆ ئەوەی گونجانێکی تەواو یان ناتەواو لەنێوان هەردوو دەنگەکە ڕووبدات. بڕوانە: assimilation. |
| contact dissimilation | مغايرة مباشرة | **نەگونجانی ڕاستەوخۆ:** ئەوەیە کە دەنگێکی زمانی ڕاستەوخۆ کار لەدەنگێکی دەوروبەری خۆی بکات و بیگۆڕێت بەجۆرێك گۆڕانەکە بەپێچەوانەی دەنگە کارتێکردووەکە بێت کەدەبێتە هۆی نەگونجانی هەردوو دەنگەکە بڕوانە: dissimilation. |
| contiguity | تجاور | **دراوسێتی (دەوروبەر):** ئەوەیە کە دوو یەکەی زمانی -یەك جۆر- لەگەڵ یەکدا دراوسێ بن، دراوسێتی یان دەرکەوتنی فۆنیمێك لەگەڵ فۆنیمێکی تردا، یان دراوسێتی مۆرفیمێك لەگەڵ مۆرفیمێکی تردا. |
| contiguous assimilation | مماثلة تجاورية | **گونجانی دەوروبەر:** بریتیە لەگۆڕانی دەنگێك بۆ ئەوەی لەگەڵ دەنگێکی دراوسێی ڕاستەوخۆی خۆیدا بگونجێت، بۆ نموونە: سەرت داگرە > سەرد داگرە لێرەدا /ت/ گۆڕاوە بە /د/ بۆ ئەوەی |

| | | |
|---|---|---|
| | | لەگەڵ /د/ی پاش خۆیە بگونجێت. |
| continuant | امتدادي | **بەردەوامی (دەنگ):**<br>دەنگێکی گیر نییە، واتە ئەو دەنگەیە کە دەکرێ ماوەی درکاندنی درێژ بکرێتەوەو تەزووی هەناسەش لەگەڵیدا بەردەوام بێت، وەکو /س، ز، ل، م، ن/ لەگەڵ ڤاوڵەکاندا ئەمەش بەرامبەر بەدەنگی گیر دەوەستێت. |
| contoid | صامت | **کۆنسنەنت:**<br>هەندێ لەزانایانی زمان ویستیان زاراوەی (contoid) بەکاربهێنن بەوەی کە گوزارشت لەکۆنسنەنت بکات وەکو دەنگێک لەبواری دەنگسازیدا. هەروەها زاراوەی (consonant)یش بەکاربهێنن بەوەی کە گوزارشت لەکۆنسنەنت بکات وەکو فۆنیمێک لەبواری زانستی فۆنیمەکاندا. |
| contour | منظومة فوقطعية | **ڕێکخستنی ناکەرتی:**<br>بریتیە لەو ئاوازو هێزانەی کە بەرەو دوای یەك دەردەکەون لەسەر فۆنیمەکانی وتەیەکدا. |
| contrast | تقابل | **بەرامبەر:**<br>ئەوەیە کە دوویەکەی زمانی جیاواز لەدوو شوێنی وەك یەك لەدوو سیاقی هاوتادا دەربکەون، بەمەرجێ ئەو جۆرە دەرکەوتنە ببێتە هۆی جیاوازی لەواتادا، وەکو بەرامبەربوونی /ب/ لەگەڵ /پ/دا لەوشەی (بار) و (پار)دا. |
| contrastive distribution | توزيع تقابلي | **دابەشبوونی بەرامبەری:** |

| | | |
|---|---|---|
| | | ـەوەیە کە فۆنیمێك لەشوێنی فۆنیمێکی تر ـبنرێت لەوشەیەکدا، ئەمەش دەبێتە هۆی ـروست بوونی وشەیەکی تری جیاواز ـەواتادا، وەکو دانانی /ه/ لەشوێنی /م/ ـوشەی /مار/دا کە وشەی (هار) دروست ـبێت. دابەشبوونی بەرامبەریش وەکو ـێگەیەك بەکاردێت لەشیکردنەوەی فۆنیمەکانی زماندا، هەروەها ئەم جۆرە ـابەشبوونە ئەوە دەسەلمێنێ کە /م/ و /ه/ ـوو فۆنیمی سەربەخۆن. |
| contrastive pair | ثنائي تقابلي | **بەرامبەری دوولایی:**<br>ـەوەیە کە دوو فۆنیم بەرامبەر بەیەك بوەستن ـەدوو شوێنی وەك یەك لەدوو وشەی جیاواز ـەواتادا، بەلاّم لەفۆنیمەکانی تردا هاوتابن، وەکو /س/ و /ز/ لە هەردوو وشەی (سالّ) و زالّ)دا. |
| contrastive stress | نبرة تقابلية | **هێزی بەرامبەر:**<br>ئەو هێزە سەرەکییە کە دەخرێتە سەر وشەیەك لەڕستەیەکدا بەمەبەستی دووپات کردنەوەی وشەکەو نەفی کردنی دژەکانی، دەکرێ هەر وشەیەك لەڕستەدا هێزی بەرامبەری بخرێتە سەر ئەگەر بێتو قسەکەر مەبەستی دووپات کردنەوەی وشەکە بێت، هەروەها ئەم هێزە دەخرێتە سەر کاری یاریدەدر و ئامرازەکانی پریپۆزیشن و پەیوەندی کردن، لەڕاستیدا تەنیا وشەیەك |

| | | |
|---|---|---|
| | | لەڕستەدا ئەم جۆرە هێزە وەردەگرێت. |
| cord | وتر صوتي | **ژێی دەنگی:**<br>یەکێکە لەتاڵە باریکەکانی دەنگ لەناو قوڕگدا، بڕوانە ژێیەکانی قوڕگ – vocal –chords |
| coronal | إكليلي | **تاجی (دەنگ):**<br>ئەو دەنگەیە کە لەکاتی درکاندنیدا پێشەوەی زمان لەگەڵیدا بەرز دەبێتەوە، واتە لەشوێنی ئاسایی خۆیدا نامێنێتەوە، ئەمەش دەنگە ددانییەکان و دەنگە پووکییەکان دەگرێتەوە، هەروەها دەبێتە سیفەتێك بۆ ئەو جۆرە دەنگە. |
| coronal articulation | نطق إكليلي | **درکاندنی تاجی:**<br>بریتیە لەدرکاندنی دەنگێکی تاجی، بڕوانە زاراوەی پێشوو. |
| correlation | ارتباط | **پەیوەندی:**<br>بریتیە لەو پەیوەندییەی کە لەنێوان دوو کۆمەڵە فۆنیمدا هەیە، وەکو پەیوەندی نێوان /ك، ت، پ/ و /گ، د، ب/ کە کۆمەڵەی یەکەم کۆنسنەنتی گیری کپن، کۆمەڵە دووەمیش کۆنسنەنتی گیری گڕن، هەروەها هەر فۆنیمێك لەکۆمەڵەی یەکەمدا هاوشێوەی هەیە لەکۆمەڵەی دووەمدا وەکو /پ،ب/ لێوین،، /ت، د/ ددانین، /ك، گ/ مەلاشوویی نەرمن. |
| crasis | ادماج | **تێکەڵ بوونی ڤاوڵەکان:** |

| | | |
|---|---|---|
| | **الصوائت** | ـرـتيه لەتێكەڵ بوونی یان لێكدانی ڤاوڵێكی<br>كۆتـایی وشـەیەك لەگـەڵ ڤـاوڵێكی سـەرەتای<br>مۆرفیمێك یان وشـەیەكی تـردا، وەكو تێكـەڵ<br>بوونی ی/ لـەكۆتایی وشـەی (ماسـی) لەگـەڵ<br>ـە لەسـەرەتای مۆرفیمی (ەكە)ی ناسیاریدا،<br>هـەر دوو ڤاوڵەكــە دەگــۆڕێن بــە /یٚ/ بــۆ<br>نموونە: ماسی+ ەكە > ماسێكە. |
| **creak** | **صريري** | **جیرە جیر ( دەنگ ):**<br>بڕوانە زاراوەی **creaky voice**. |
| **creaky voice** | **صوت صريري** | **دەنگی جیڕەدار:**<br>ئەو دەنگەیە كە لەكاتی دركاندنیدا بەشێك<br>لەزمانۆچكە لەسەرخۆ لەگەڵیدا دەلەرێتەوەو<br>بەشـەكەی تریشـی بەشـێوەیەكی ئاسـایی<br>دەلەرێتەوە. |

# - D -

| | | |
|---|---|---|
| darkL | لام مفخمة | **لامی قەڵەو:** بریتیــە لــەدەنگی لامــی بەلأمەشــوکراو، لــەزمانی کوردیــدا لــەپێش ڤــاوڵ یــان کۆنســنەنت دەردەکــەوێت، یــان دەکەوێتــە کۆتـایی وشـەوە وەك: چڵکن، کـلأو، گـولأو، دڵ، گڵ. |
| dark lateral | جانبي مفخم | **لایی قەڵەو ( دەنگ ):** دەنگێکی لایی بەمەلأشو کراوە کە ئاماژە بۆ لامـی قەڵـەو دەکـات، بڕوانـە لامـی قەڵـەو –darkL–. |
| dark letter | حرف مفخم | **پیتی قەڵەو:** ئـەو پیتەیـە کـە ئامـاژە بـۆ دەنگـی قەڵـەو دەکـات، قەڵــەو بــوونی دەنگــیش بــەهۆی کـردەی بـەر مەلأشـودانی نـەرم velarization ئــەنجام دەدرێــت، ئەمــەش وەك کردەیــەك بریتیــە لەبەرزبوونــەوەی بەشــی پشــتەوەی زمان بەرەو مەلأشوی نەرم لەگـەڵ کشانەوەی زمــان بــەرەو دواوە، وەکــو پیتــی /ڵ، ڕ/ی قەڵـەو لـەزمانی کوردیـدا کەبەرامبـەر بـەپیتی /ل، ر/ی سوك دەوەستن. |
| dark vowel | صائت مفخم ( خلفي ) | **ڤاوڵی قەڵەو ( پشتەوە ):** بڕوانە back vowel. |
| dead letter | حرف غير منطوق | **پیتی نەدرکاو:** ئـەو پیتەیـە کـە دەنووسـرێ بـەلأم نـادرکێ |

| | | |
|---|---|---|
| | | وەکو /k/ لەوشەی (knife)ی ئینگلیزیدا. |
| de- aspiration | ازالة الهائية | **لابردنی هائی:**<br>بریتیە لەلابردنی یان کەم کردنەوەی سیفەتی هائی دەنگێك کە لەبنەڕەتدا دەنگەکە هائی بێت، بڕوانە زاراوەی aspirate. |
| deep vowel | صائت عميق (خلفي) | **ڤاولی قوول (پشتەوە):**<br>بڕوانە back vowel. |
| defective writing | كتابة ناقصة | **نوسینی ناتەواو:**<br>ئەو جۆرە نووسینەیە کە تەنیا کۆنسنەنتەکانی تێدا نیشان دەدرێت. |
| delabialization | ازالة التدوير<br><br>عدم التدوير | **١-لابردنی لێو خڕبوون:**<br>دەرکاندنی دەنگێك بەبێ خڕبوونی لێو کە دەنگەکە لێو خڕبوونی لەگەڵدایە.<br>**٢-خڕنەبوون:**<br>دەرکاندنی دەنگێك کە لەبنەڕەتدا لێو خڕبوونەوەی لەگەڵدا نییە وەکو ڤاوڵەکانی ی، ێ/ی پێشەوە، ڤاوڵەکانی /ه، ا/ی ناوەڕاست ئەمانەش بەرامبەر بەڤاوڵەکانی و، وو، ۆ/ی پشتەوە دەوەستن کەلێو خڕبوونەوەیان لەگەڵدایە. |
| deletion | حذف | **لابردن (فڕێدان):**<br>بریتیە لەلابردنی یان فڕێدانی دەنگێك یان مۆرفیمێك یان وشەیەك بەپێی سیستەمی زمانەکە. |

| | | |
|---|---|---|
| demi-occlusive sound | صوت نصف مغلق | **دەنگی نیوە داخراو:** |
| denasalization | ازالة الأنفية | **لابردنی بەلوت کردن ( منگنی ):**<br>بریتیە لەدرکاندنی دەنگێکی لووتی بێ ئەوەی سیفەتی منگنی لەگەڵدا بێت. |
| dense sound | صوت كثيف | **دەنگی چڕ:**<br>ئەو دەنگەیە کە لەدوو دەنگ پێك هاتووە یەکەمیان کپەو دووەمیان /h/یە ، وەکو /kh/، /ph/، ئەمەش جیاوازی لەگەڵ دەنگی هائی وەکو /k'/، /p'/دا هەیە. |
| dental | اسناني | **ددانی ( دەنگ ):**<br>ا–ئەو دەنگەیە کە نووکی زمان لەگەڵ دیوی ناوەوەی دانەکانی سەروو یان خواروو لێك دەکەون وەکو /ت/ لەزمانی کوردیدا.<br>ب–سیفەتە بۆ ئەو جۆرە دەنگە. |
| dental sound | صوت اسناني | **دەنگی ددانی:**<br>بڕوانە dental. |
| dental stop | انفجاري اسناني | **گیری ددانی:**<br>ئەو دەنگەیە کەشێوەی درکاندنی گیرە، سازگەکەشی (شوێنی دروست بوونی) ددانە، نووکی زمانیش وەك درکێنەر بەشداری لەدروست بوونی دەکات، وەکو /ت/ لەکوردیدا. |
| dentilabial | شفوي اسناني | **لێو ددانی:**<br>ئەو دەنگەیە کەلێوی خواروو لەگەڵ دانەکانی سەروو –پێشەوە– بەشداری |

| | | |
|---|---|---|
| | | ـەرکانـدنی دەکـەن وەکـو /ف، ڤ/ هـەروەها ـەدانی لێوی labio dental ناو دەبرێت. |
| depalatalization | ازالة التغوير | **لابردنی بەر مەلاشودان:** بریتیـە لـە نەهێشـتنی سـیفەتی بـەر مەلاشـودانی ڕەق لەدرکانـدنی دەنگێکـی بەرمەلاشـودراوی ڕەقـدا، بـۆ نموونـە ـرکانـدنی /ط/ وەکـو /ت/ کـە لەوشـەی طاهر)دا دەبێت بە (تاهیر). |
| dependent sound change | تغير صوتي تابع | **گۆرانی دەنگی شوێن کەوتوو:** بریتیە لە گۆڕانی هەر دەنگێك کە بکەوێتە ژێـر کـارتێکردنی ژینگـەی دەنگـی دەوروبەرەوە. |
| descending diphthong | تنصائت هابط | **ڤاولی دوولانەی نزم:** ئـەو ڤاولـە دوو لانەیـە کـە سـەرەتاکەی بەرزەو پاشان نزم دەبێتـەوە، هـەروەها بـە (falling diphthong) ناو دەبرێت. |
| descriptive phonetics | علم الاصوات الوصفي | **فۆنەتیکی وەسفی:** ئـەو زانسـتەیە کـە لـە دەنگـەکانی زمـان دەکۆڵێتـەوە وەکـو ئـەوەی بـەکار دێـت لەکات و شوێنێکی دیاریکراودا، هـەروەها بە synchronic phonetics ناودەبرێت. |
| devocalization | إهماس | **کپ بوون:** بریتیـە لـەلابردنی گـڕی دەنگێکـی گـڕ بـەهۆی ژینگـەی دەنگـی دەوروبـەرەوە، واتـە دەنگـە گڕەکـە سـیفەتی کپـی |

| | | |
|---|---|---|
| | | وەردەگرێت، هەروەها بە (unvoicing)یش ناودەبرێت. |
| devoiced= unvoiced | مهمس | **کپ کراو (کپی):**<br>سیفەتە بۆ ئەو دەنگەی کە گڕی نامێنیٚو دەکەوێتە ژێر کارتێکردنی کپ بوونەوە. |
| devoiced plasive | انفجاري مهمس | **گڕی کپ کراو:**<br>دەنگێکی ناهائی یە گڕییەکەی لابراوە یان کەم کراوەتەوە پاش ئەوەی کە دەکەوێتە ژێر کارتێکردنی کپ بوونەوە. |
| devoicing | إهماس | **کپ بوون:**<br>بڕوانە devocalization. |
| deiachronic phonetics | علم الاصوات التاريخي | **فۆنەتێکی دایکرۆنێك (مێژوویی):**<br>ئەو زانستەیە کە بەراوردی دەنگەکانی زمانێك دەکات لەدوو قۆناغی جیاواز یان زیاتر لەگەشەکردن و پەرەسەندنی زمانەکەدا بەپێی تێپەڕبوونی کات و سەردەمی مێژوویی هەروەها بە فۆنەتێکی مێژوویی historical phonetics ناودەبرێت. |
| diacritic | علامة مميزة | **نیشانەی جیاکەرەوە:**<br>ئەو نیشانەیەیە کە لەسەر یان لەژێر دەنگەوە دادەنرێت بۆ ئەوەی ئەو سیفەتە زیادەی کە وەری گرتووە لە دەنگە بنچییەکەی جیای بکاتەوە، وەك ئەو نیشانەیەی کە گوزارشت لەهائیەت دەکات لە [پʽ] یان ئەو نیشانەیەی کە گوزارشت لەقەڵەوی دەکات لە [ت.]. |

| | | |
|---|---|---|
| diacritic mark | علامة مميزة | **نيشانەی جیاکەرەوە:**<br>بڕوانە زاراوەی **diacritic**. |
| diaeresis | ازدواج صوتي | **جووتە دەنگ:**<br>بریتیە لەجیاکردنەوەی ئەو دوو دەنگەی کەیەك دەنگییان پێك هێناوە بۆ ئەوەی هەر یەکێکیان وەکو دەنگێکی سەربەخۆ نحریکەون، ئەم دیاردەیە لەهەندێ وشەی کوردیدا بەدی دەکرێت کە هەر دوو دەنگەکە بەسەربەخۆیی و جیاواز دەدرکێن، وەکو: چاکردن- چاك کردن. |
| diaphone | ثنصوت، ديفون | **دەنگی دوولایی ( دایە فۆن ):**<br>ئەو دەنگەیە کە لەدوو زاری هەمان زماندا لەڕووی درکاندنەوە جیاواز بن، بەلاَم لەڕووی ئەرکەوە هەمان ئەرکییان هەبێت، وەك /وو/ لەوشەکانی (دوور، قوولْ) لەزاری ناوەڕاستدا لەگەلْ /وی/ لەوشەکانی (دویر، قویل) لەزاری گەرمیاندا. |
| diaphragm | الحجاب الحاجز | **ناوپەنچك:**<br>ئەندامێکی یاریدەدەرە لەپرۆسەی هەناسەداندا، دەکەوێتە نێوان سنگ و سکەوە، یارمەتی بەرز بوونەوەو نزم بوونەوەی سییەکان دەدات. بە بەرزبوونەوەی ناوپەنچك هەوا لەسییەکانەوە دێتە دەرەوە بەنزم بوونەوەی هەوا لەدەرەوە دێتە ناو سییەکان. |
| diffuse consonant | صامت منتشر | **کۆنسنەنتی پەرت:**<br>وەك کۆنسنەنتی پووکی یان ددانی یان |

| | | |
|---|---|---|
| | | لێـوی، هــەروەها بەکۆنســنەنتی پێشــەوە anterior consonant ناودەبرێت. |
| digraph | ثنحرف | **جووتە پیت:**<br>دووپیت کە گوزارشت لەتاکە دەنگێك بکەن، وەك: (ph) و (th)ی ئینگلیزی کە گوزارشت لەدەنگی [f] و [Ø] دەکەن. |
| diphthong | ثنصائت | **ڤاوڵی دوولانە:**<br>ئـەو دەنگەیـە کـە لـەدوو ڤـاوڵی سـادە یـان ڤـاوڵێکی سـادەو نیمچـە ڤاوڵێـك پێـك دێـت لەبڕگەیەکـدا، لـەزمانی کوردیـدا دوو ڤـاوڵ بـەرەو دوای یـەك دەرناکـەون، بـەلاّم ڤـاوڵ لەگــەڵ نیمچــە ڤاوڵــدا ئاســایی لەوشــەو بڕگەکاندا دەردەکەون وەك: /ya/ لە (یار)دا، /aw/ لە (چاو)دا. |
| diphthongation | ادغام الصوائت | **تێکەڵ بوونی ڤاوڵەکان:**<br>بریتیـە لەتێکـەڵ بـوونی (یـەك بـوونی) دوو ڤاوڵی بەرەودوای یەك لەڤاوڵێکدا. |
| diphthongiation | ادغام الصوائت | **تێکەڵ بوونی ڤاوڵەکان:**<br>لێرەدا مەبەسـت لـەکردەی تێکـەڵ بوونـە، کـە دوو ڤـاوڵی بـەرەودوای یـەك تێکـەڵ دەبـن لەڤاوڵێکـدا وەك: ی+ ە ← یێ، بـۆ نموونـە: ڕێوی+ەکە > ڕێوێکە. |
| direct palatography | التصوير المباشر للحنك | **وێنەگرتنی ڕاستەوخۆی مەلاشوو:**<br>بریتیــە لەوێنــەگرتنی مەلاشــوو لــەکاتی درکانـدنی دەنگێکـی زمانیـدا، یـان نیشـانە کردنــی ڕاســـــتەوخۆی ئــەو شــوێنە بــۆ ئەوەی خاڵی لێکەوتنی (تماس) ئەندامەکان |

| | | |
|---|---|---|
| | | ـیـاری بکرێـت لـەکاتی دروسـت بـوونی ـدەنگەکەدا. |
| disembodied voices | اصوات غير مرئية | **دەنگە نەبینراوەکان:**<br>بریتیە لەو دەنگانەی کەمرۆڤ دەی درکێنێ، بـەڵام گـوێگر قسـە کەرەکـەی نـابینێ وەکـو ـدەنگە تۆمارکراوەکان. |
| disiunction vowel | صائت فاصل | **ڤاوڵی جیاکەرەوە:**<br>ئەو ڤاوڵەیە کە دەچێتە نێوان دوو وشە بۆ ئەوەی هەر دوو کۆنسنەنتی کۆتایی وشەی یەکەم و سەرەتای وشەی دووەم یەك نەگرن و جیایان بکاتەوە، وەك /ە/ لە گوڵ+ باخ > گوڵە باخ. |
| dissimilation | مخالفة | **نەگونجان ( دوورکەوتنەوە ):**<br>بریتیـە لـەگۆڕانی دەنگێـك بـۆ ئـەوەی بەپێچـەوانەی دەنگێکـی دەوروبـەری خـۆی بێـت، وەکـو گـۆڕانی /ش/ بـە /ر/ لـە پـاش+ شێو > بارشێو<br>مەبەست لەنەگونجان زیادکردنی جیاوازییە لەنێوان دەنگەکاندا، بەپێچەوانەی دیاردەی گونجـان کـە دەبێتـە هـۆی کـەم کردنـەوەی جیاوازی نێوان دەنگە دراوسێکان. |
| dissonance | تنافر صوتي | **نەشازی دەنگ ( دوورکەوتنەوەی ):**<br>نەشـازی دەنـگ لـەئاکامی چـەند دەنگێکـی دەوروبەر پەیدا دەبێت کە ئاوازە دار نین و گـرانن بەسـەر گـوێ، یـان درکانـدنیان بەسـەر یەکەوە ئاسان نەبێت. |
| distant assimilation | مماثلة | **گونجانی دوور:** |

| | | |
|---|---|---|
| | متباعدة | گۆڕانی دەنگێك بۆ ئەوەی لەگەڵ دەنگێكی تردا بگونجێت كەڕاستەوخۆ دراوسێ نین وەك قەڵەوبوونی /س/ و /ت/ لەوشەكانی (ساڵ) و (تاڵ)دا بۆ ئەوەی لەگەڵ /ڵ/ی قەڵەودا بگونجێن. |
| distant dissimilation | مغايرة متباعدة | **نەگونجانی دوور:** گۆڕانی دەنگێك بەمەبەستی دووركەوتنەوەو نەگونجانی لەگەڵ دەنگێكی تردا كەڕاستەوخۆ دراوسێ نین. |
| distinctive feature | سمة مميزة | **سیمای جیاكەرەوە:** سیمایەكی دەنگییە كە فۆنیمێك لەفۆنیمێكی تر جیادەكاتەوە لەزمانێكدا. وەكو گڕیو كپی دەنگ یان سوك و قەڵەوی یان درێژی دەنگ، بۆ نموونە دەنگە گیرەكانی /د: ت، ب: پ/، سازگەی دروست بوونی هەر جووتە دەنگێك وەكو یەكە بەڵام سیمای جیاكردنەوەیان تەنیا لەگڕیو كپیدایە، واتە لەرینەوەی ژێیەكانی قورگ لە /د/ دەلەرێتەوە لە /ت/ نالەرێتەوە، هەروەها لە /ب/ دەلەرێتەوە لە /پ/ نالەرێتەوە، كەچی سیمای گڕیو كپی لەگەڵ دەنگە لازمانییەكانی /ل: ڵ/دا نابێت چونكە هەردووكیان گڕن، بەڵكو سووكیو قەڵەوی وەك دوو سیمای جیاكردنەوە بۆ ئەم دوو دەنگە بەكاردێن. |
| distraction | فك، | **لێك بوونەوە ( جیابوونەوە ):** |

| | | |
|---|---|---|
| | تحليل | ـڕتیه لەگۆڕانی ڤاوڵێکی لێکدراو یان درێژ ـ ـوو ڤاوڵی سەربەخۆ. |
| distribution | توزيع | **ـبەش بوون:**<br>ـەو ژینگە زمانییانەی کە کەرەسەیەکی ـمانی تێدا دەردەکەوێت لەگەڵ کاریگەری ـەو ژینگانە بەسەر کەرەسەکەدا، بۆ نموونە ـەر فۆنیمێك دابەش بوونی تایبەتی خۆی ـەیە کە بەپێی ئەلۆفۆنەکانی ئەو فۆنیمە ـسەر شوێنەکاندا دابەش دەبن، هەروەها ـەو شوێنانەی کەتێیدا دەردەکەون یان ئەو ـشوێنانەی کە دەرناکەون لەگەڵ ئەو فۆنیمانەی کە لەپێش و پاشیدا دەردەکەون، هەمان شت دەشێ بوترێ سەبارەت بەدابەش بوونی مۆرفیم یان وشە یان ڕستە. |
| disyllabic | ثنائي المقاطع. | **دووبڕگەیی:**<br>سیفەتە بۆ ئەو وشەیەی کە لەدوو بڕگە پێك دێت. |
| disyllabic word | كلمة ثنائي المقاطع | **وشەی دووبڕگەیی:**<br>هەر وشەیەك کە لەدوو بڕگە پێك بێت، وەك: شەو/ بۆ. |
| domal= retroflex | ارتدادي | **هەڵگەڕاو:**<br>بڕوانە زاراوەی (cacuminal). |
| domal sound | صوت ارتدادي | **دەنگی هەڵگەڕاو:**<br>بڕوانە زاراوەی (cacuminal). |
| dorsal | خلفي | **پاشەوە:**<br>أ–ئەو دەنگەیە کەپشتەوەی زمان وەك درکێنەر بەشداری تێدا دەکات و مەلاشوی |

| | | |
|---|---|---|
| | | نەرمیش دەبێتە سازگەی دروست بوونی دەنگەکە وەك /ك/ و /گ/.<br>ب-سیفەتە بۆ ئەو جۆرە دەنگە.<br>ج-سیفەتە بۆ پشتەوەی زمان کەپێی دەوترێ (dorsum). |
| **dorso-** | **خلفي** | **پاشەوە:**<br>وەك سەرەتا بەکاردێت، لەوشەی (dorsum) وەرگیراوە بڕوانە زاراوەی پاشەوە. |
| **dorso- alveolar** | **لثوي خلفي** | **پووکی -پاشەوە:**<br>ا-ئەو دەنگەیە کە لەگەڵ درکاندنیدا پشتەوەی زمان لەپووکی ددان نزیك دەبێتەوە.<br>ب-سیفەتە بۆ ئەو جۆرە دەنگە. |
| **dorso- palatal** | **غاري خلفي** | **مەلاشویی ڕەق- پاشەوە:**<br>ا-ئەو دەنگەیە کە لەلێکەوتنی (تماس) پشتەوەی زمان و مەلاشوی ڕەق دروست دەبێت.<br>ب-سیفەتە بۆ ئەو جۆرە دەنگە. |
| **dorso- uvular** | **لهوي خلفي** | **زمانۆچکەیی- پاشەوە:**<br>ا-ئەو دەنگەیە کەپشتەوەی زمان وەك درکێنەر بەشداری تێدا دەکات و زمانۆچکەکەش دەبێتە سازگەی دروست بوونی دەنگەکە.<br>ب-سیفەتە بۆ ئەو جۆرە دەنگە. |
| **dorso- velar** | **طبقي خلفي** | **مەلاشویی نەرم- پاشەوە:**<br>ا-ئەو دەنگەیە کە لەلێکەوتنی (تماس) پشتەوەی زمان و مەلاشوی نەرم دروست |

| | | |
|---|---|---|
| | | ـحيت. وەكو /ك، گ، ن/<br>ب-سيفەتە بۆ ئەو جۆرە دەنگە. |
| dorso- velar stop | النفجاري طبقي خلفي | **گیرۆ مەلاشویی نەرم- پاشەوە:**<br>ـەنگێکـی گـیری وەسـتاوە، درکێنەرەکـەی پشـتەوەی زمانـەو شـوێنی دروسـت بـوونی دەنگەکـەش مەلاشـوی نەرمـە، وەکـو ـت. گ/. |
| dorsum | مؤخر اللسان | **پشتەوەی زمان:**<br>ـەو بەشەیە لەزمان کە دەکەوێتە نێوان ڕەگ و ناوەڕاسـتی زمـان، هـەروەها ئـەم بەشـە ـەکەوێتە ژێر مەلاشـوی نەرمـەوە. لەڕاسـتیدا زمـان لـەپێنج بـەش پێـك دێـت کـە ئەمانـەی خوارەوەن: ١-نووکی زمان apex<br>٢-پێشەوە front ٣-ناوەڕاست center<br>٤-پشتەوە dorsum ٥-ڕەگ root. |
| double articulation | نطق مزدوج | **درکاندنی دوولایی:**<br>درکانـدنی دەنگێکـی زمـانی بەداخسـتنی ڕێـڕەوی هەناسـە لەیـەك کاتـداو لـەدوو شـوێنی جیـاوازدا، وەك لەدرکانـدنی وشـەی (کـپ)دا ڕوودەدات کـە ڕێـڕەوی هەناسـە لەپشـتەوەی زمان و هـەر دوو لێـو لەکاتێکـدا دادەخرێت. |
| double- bar juncture | فاصل مزدوج | **هەڵوەستەی دوولایی:**<br>فـۆنیمێکی ناکەرتیـە نیشـانەکەی بـەم شـێوەیە /II/. زۆرجـار دەبێتـە هاووتـای نیشـانەی پرسـیار کـردن و لـەکۆتایی ئـەو |

| | | |
|---|---|---|
| | | پرسیارە دادەنرێت کە بەوشەی بەڵێ و نەخێر وەڵام دەدرێتەوە، هەروەها ئەم جۆرە هەڵوەستەیە بەهەڵوەستەی بەرز بوونەوە /↗/ rising juncture– ناودەبرێت. |
| double-crossjuncture | فاصل مصلب | **هەڵوەستەی توند:** فۆنیمێکی ناکەرتییە نیشانەکەی بەم شێوەیەیە /#/ نزم بوونەوەی ئاوازەی لەگەڵدایەو لەکۆتایی ڕستەی هەواڵدا دێت یان ئەو ڕستە پرسیارانەی کە بەوشەی بەڵێ و نەخێر وەڵام نادرێنەوە، هەروەها بەهەڵوەستەی نزم بوونەوە / ↘ / – falling juncture– ناودەبرێت. |
| doubled consonant | صامت مضعف | **کۆنسنەنتی دووبارە کراو:** ئەو کۆنسنەنتەیە کە لەکۆتایی بڕگەی یەکەم و سەرەتای بڕگەی دووەمدا دووبارە دەبێتەوە، وەکو: میللەت، شەممە. |
| double structure | تركيب مزدوج | **ڕۆنانی دوولایی:** یەکەیەکی زمانی کەدوو ڕۆنانی هەبێت، یەکێکیان لەئاستی خۆیدا بێت و ئەوی تریان لەئاستێکی بەرزتر لەئاستەکەی خۆی. بۆ نموونە فۆنیم لەئاستی خۆیدا ڕۆنانێکی دەنگی هەیە، بەڵام لەگەڵ فۆنیمەکانی تردا ڕۆنانێکی مۆرفیمی پێك دێنن کە ئاستەکەی لەئاستی فۆنیمی بەرزترە، هەروەها مۆرفیم دوو ڕۆنانی هەیە ڕۆنانێکیان وەکو مۆرفیم و ئەوی تریان کەدەبێتە پێکهێنەرێك لەپێکهێنەرەکانی وشە. |

| | | |
|---|---|---|
| doubling | تضعيف الصامت | **ـعيـارمكردنەوەی كۆنسنەنت:** ـحـوـيـك هاتنی هەمان كۆنسنەنت لـەكۆتايی ـ ـگـمـيـك و سەرەتای برگەی پاشەوە لەهەمان ـ ـشـعـا. |
| drag chain | سلسلة جاذبة | **ـ ـنجيرە راكێشان:** ـــەو گۆڕانـــەی كـــە بـــەپێی بـــاوی‌و زۆری ـــەكارهێنانی دەنگێـــك ڕوودەدات و دەبێتـــە ـەوی لادانی دەنگێكی تر لەسنووری گەشـەو ـگـۆڕانی مێژوویی زماندا. |
| duration | كمية الصوت، طول الصوت | **ـماوەی دەنگ ( درێژی ):** ـــەو ماوەيـــەی كـــە دركانـــدنی دەنگـــی تێـــدا ـــەرنەوام دەبێـــت، هـــەر لەســـەرەتای دروســـت ـبوونيـــەوە تاكۆتـــايی پـــێ دێـــت، هـــەروەها بـــە length يان quantity ناودەبرێت. |

# - E -

| | | |
|---|---|---|
| echo | تكرار الصدى | **دووبارەبوونی دەنگدانەوە:**<br>دووبارە بوونـەوەی دەنگێـك بـەخێرایی بـۆ چەند جارێك بەدوای یەكدا لەڕستەیەكدا یان لەچەند ڕستەیەكی دوا بەدوای یەك. |
| eclipsis | خذف الصامت | **لابردنی كۆنسنەنت:**<br>لابردنـی دەنگـی كۆنسـنەنت لـەگۆكردن یـان لەنووسیندا. |
| economy tendency | الميل الى الاقتصاد | **ئارەزوی كەم كردنەوە:**<br>ئـەو ئـارەزووەی كـە لەزمانـدا هەیـە بـۆ كـەم كردنـەوەی ئـەرك بەڕێگـەی كـورت كردنـەوەو لابـردن و ڕێكخسـتنی سـازگەی دەنگـەكان و گونجانیان لەگەڵ لایەكتردا. |
| ecthlipsis | خدف الصامت | **لابردنی كۆنسنەنت:**<br>بڕوانە (eclipsis). |
| egressive | زفيري، انبثاقي | **هەناسەیی ( دەرهاتوو ):**<br>ئــەو دەنگەیــە كــە لــەكاتی دەرچــوونی هەناسەدا دروست دەبێت. |
| egressive air | هواء انبثاقي | **هەوای دەرهاتوو:**<br>ئــەو هەوایــەی كــە لەگــەڵ هەناســەداندا دەردەچێت. |
| egressive stop | انفجاري انبثاقي | **گیری دەرهاتوو:**<br>ئـەو دەنگـە گـیرەی كـە لـەپاش دركانـدنی هــەوای ســییەكان دێتــە دەرەوە هــەروەها pressure stop ناودەبرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| ejective | قذفي | **دەرهاویشتن ( فرێدان ):**<br>ئـەو دەنگەیــە کــە لــەکاتی درکاندنیــدا زمانۆچکە لەگەڵیدا دادەخرێ‌و لای سەرووی زمانۆچکەش تەنگ دەبێت. |
| ejective consonant | صامت قذفي | **کۆنسنەنتی دەرهاویشتن:**<br>ئـەو کۆنســنەنتەی کــە لەگــەڵ درکاندنیــدا تەقینەوەی قورگی ڕوودەدات |
| ejective stop | انفجاري قذفي | **گیری دەرهاتوو:**<br>بڕوانە ejective. |
| elision | حذف، ترخيم | **لابردن ( کەوتن ):**<br>أ-لابردنی دەنگێك لەناوەڕاستی وشـەیەکدا بەمەبەســتی ئاســانی درکانــدن، وەك:<br>دەستەسڕ > دەسەسڕ<br>ب-لابردنی ڤاوڵێك یان بڕگەیەك بە مەبەستی ئاسانی درکاندن. |
| eme prineiple | مبدأ الايم ( مبدأ الوحدات المجردة) | **بنەمای ئیمی: ( بنەمای یەکەی ڕووت ):**<br>کۆکردنــەوەی چــەند گــۆڕانێکی زمــانی لەئاســتێکدا لەکۆمەڵەیــەکی ڕووتــدا (ئەبســتراکدا)، وەك کۆکردنــەوەی چــەند دەنگێك لەفۆنیمێکدا هـەروەها کۆکردنـەوەی چـەند ڕێژەیـەك لەمۆرفیمێکـدا، یـان چـەند پیتێك لەگرافیمێکدا. |
| emic | مميز | **جیاواز:**<br>سیفەتێك ئاماژە بۆ ئەو یەکەیە بکات کە سەر بەئیمێکە، وەکو فۆنیم و مۆرفیم و گرافیم. |
| ending | لاحقة | وەك زاراوەیەك بۆ ئەم مەبەستانە بەکاردێت:<br>**١- پاشگر:**<br>بڕوانە: suffix |

| | | |
|---|---|---|
| | صوت ختامي<br>مقطع ختامي | ٢-دهنگی کۆتایی<br>٣-برگەی کۆتایی |
| environment = context | بيئة، سياق | **ژینگە، دەوروبەر:**<br>ئەو یەکە زمانییانەی کە لەدەوروبەری فۆنیمێك یان مۆرفیمێك یان وشەیەك یان ڕستەیەکدا دەردەکەون. |
| environmental | اشراط بيئي | **مەرجی ژینگەیی:**<br>ئەو مەرجانەی کە لەژینگەی دەنگدا هەیەو کار لەسیماکانی دەنگەکە دەکەن بەجۆرێك کە لەگەڵ ژینگەکەیدا بگونجێت یان بەپێچەوانەی ژینگەکەی بێت. |
| epenthesis | اقحام | **دەرکەوتن:**<br>زاراوەیەکە ئەم مەبەستانە دەگرێتە خۆی:<br>أ-ئەوەیە کەزمان ڤاوڵێکی تازە بەرهەم بهێنێ بۆ ئەوەی لەگەڵ سیستەمی دەنگی زمانەکەدا بگونجێت و ڕێك بکەوێت.<br>ب-زیادکردنی دەنگێك لەناوەڕاستی وشەیەکدا بەمەبەستی ئاسانی درکاندن. |
| epenthetic | صوت مقحم | **دەنگی دەرکەوتوو (زیادە):**<br>ئەو دەنگەی کە لەناوەندی وشەدا زیاد دەکرێت بەمەبەستی ئاسانی درکاندن، وەك: بررا) بردرا. |
| epiglottal | لهوي | **زمانۆچکەیی (دەنگ):**<br>أ-ئەو دەنگەیە کە زمانۆچکە بەشداری لەدرکاندنی دەکات.<br>بڕوانە (uvular).<br>ب-سیفەتە بۆ دەنگی زمانۆچکەیی. |

| | | |
|---|---|---|
| | | ج-سـيفەتە بـۆ زمانۆچـكە خـۆی، بڕوانـە (epiglottis). |
| epiglottic | لهوي | **زمانۆچكەیی:**<br>ئـەوەی پەیوەنـدی بەزمانۆچـكەوە هەیـە. بڕوانە زاراوەی پێشوو. |
| epiglottis | اللهاة، لسان الزمار | **زمانۆچكە:**<br>ئەو پارچە گۆشتەیە كە سەرپەرشتی ڕێگەی هەناسە دەكات لەگەرووداء لەكاتی قوتدانی خواردن ڕێگـەی هەناسـە دادەخـات. بڕوانـە (uvula). |
| ethnophonemic transcription | كتابة فونيمة عرفية | **نووسینی فۆنیمی نەریتی:**<br>نووسینەوەیەكی دەنگییـە تـەرخان كراوە بـۆ خزمەت كردنی گەلێك بەو نیشانانەی كـەباوە لەناو گەلەكەدا. |
| euphony | عذوبة الصوت<br>صوت عذب<br>تحسين الصوت | وەك زاراوەیەك ئەم مەبەستانە دەگەیێنێ:<br>**١-سازگاری دەنگ**<br>**٢-دەنگی سازگار**<br>**٣-ڕاست كردنەوەی دەنگ:**<br>ئـەو ئـارەزووەی لەزمانـدا هەیـە بـۆ ڕاسـت كردنـەوەی دەنگـەكانی زمـان بەمەبەسـتی ئاسانی دركاندن. |
| evolitive phonetics | علم الاصوات التطوري (التاريخي) | **فۆنەتیكی گەشەكردن (مێژوویی):**<br>ئــەو زانســتەیە كــە لەگەشــەو گــۆڕانی دەنگەكانی زمانێك دەكۆڵێتەوە بەپێی قۆناغە جیاجیاكانی كەزمانەكەی پێدا تێ دەپەڕێت، هــەروەها بــە: diachronic phonetics و historical phonetics ناو دەبرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| evolutionary phonetics | علم الاصوات التطوري (التاريخي) | **فۆنەتیکی گەشەکردن (مێژوویی):**<br>بڕوانە *evolitive* **phonetics**. |
| exclamatory pitch | نغم التعجب | **ئاوازەی سەرسوڕمان:**<br>ئەو ئاوازەیە کە پلەیەکی بەرزی هەیەو لەڕستەی سەرسوڕماندا بەکاردێت. فۆنیمێکی ناکەرتیەو ئەم نیشانەیەی بۆ بەکاردێت /4/، هەروەها بەئاوازەی سەرووی بەرزەوە (extrahigh pitch) ناودەبرێت، سێ ئاوازەکەی تریش ئەمانەن: ئاوازەی نزم lowpitch ئاوازەی ئاسایی normal pitch، ئاوازەی بەرز high pitch . |
| excrescent sound | صوت مقحم | **دەنگی زیاد کراو:**<br>ئەو دەنگەیە کە لەناوەندی وشەیەکدا زیاد دەکرێت بۆ ئاسانی درکاندن. |
| exhalation | زفير | **هەناسەدان:**<br>دەرکردنی هەوا لەسییەکانەوە لەکاتی هەناسەداندا، بێگومان زۆربەی دەنگەکانی زمان بەو هەوایە دروست دەبن کە لەسییەکانەوە دێتە دەرەوە. |
| experimental phonetics | علم الاصوات التجريبي | **فۆنەتیکی تاقیکردنەوە:**<br>ئەو زانستەیە کە دیراسەی تایبەتیەکانی دەنگەکانی زمان دەکات بە بەکارهێنانی ئامێری ئەلیکترۆنی. |
| expiration | زفير | **هەناسەدان:**<br>بڕوانە **exhalation**. |
| expiratory stress | نبرة زفيرية | **هێزی هەناسەدار:**<br>ئەو هێزەیە کە لەگەڵ دەرکردنی هەوای |

| | | |
|---|---|---|
| | | هەناسەدا دروست دەبێت. |
| explosion | انفجار | **گیر (وەستاو):**<br>ئەو دەنگەی کە لەئەنجامی کرانەوەی کت و پڕی ڕێڕەوی هەناسە دروست دەبێت پاش داخستنی لەسازگەیەکی تایبەتدا بۆ ئەوەی ئامادە بێت بۆ دروست کردنی دەنگێکی گیر. کرانەوەی ڕێڕەوی هەناسەش دەبێتە هۆی دەرچوونی کت و پڕی ئەو هەوایەی کە پەنگی خواردووە. |
| explosive = plosive | انفجاري | **گیری (دەنگ):**<br>ئەو دەنگە زمانییەی کە بەداخستنی ڕێڕەوی هەناسەو پەنگ خواردنی هەواو پاشان بەرەڵا کردنی کت و پڕی هەواکە دروست دەبێت بڕوانە (stop). |
| explosive articulation | نطق طارد | **درکاندنی تەقیو:**<br>درکاندنی دەنگێکی زمانی لەگەڵ دەرکردنی هەناسە لەسییەکانەوە بەڕێگەی زار یان لووتەوە یان بەڕێگەی زارو لووتەوە. ئەم کارەش لەدرکاندنی زۆربەی دەنگەکاندا ڕوو دەدات. |
| expression | تعبير | **دەربڕین:**<br>بریتییە لەو شێوە دەنگییەی یان شێوە نووسینەی کەزمان وەری دەگرێت بەمەبەستی دەربڕین. |
| external hiatus | وقفة بين صائتين | **وەستانی نێوان دوو ڤاوڵ:**<br>ئەو وەستانەی کە لەنێوان دوو ڤاوڵی دوا بەدوای یەکدا ڕوو دەدات. ڤاوڵێکیان لەکۆتایی وشەی یەکەمدا بێت و ئەوی تریان |

| | | |
|---|---|---|
| | | لەسەرەتایی وشەی دووەمدا بێت. |
| external juncture | فاصل خارجي | **هەڵوەستەی دەرەکی:**<br>فۆنیمێکی ناکەرتییە لەکۆتایی قسەکردندا دێت و یەکسەر پێش وەستان یان هەڵوەستەکردن، نیشانەکەی بەم شێوەیە دەبێت /↗/ ئەگەر هەڵوەستەکە بەرەو سەرەوە بێت، ئەگەر هەڵوەستەکە بەرەو خوارەوە بێت نیشانەکەی بەم شێوەیە دەبێت /↙/. |
| external sandhi | تغيير صوتي خارجي | **گۆڕانی دەنگی دەرەکی:**<br>گۆڕانێکی دەنگییە لەسنوری دەرەوەی مۆرفیمدا ڕوودەدات. |
| extra high pitch | النغم فوق العالي | **ئاوازەی سەرووی بەرز:**<br>ئاوازەیەکی ناکەرتییە بە بەرزترین پلەی ئاوازە دادەنرێت، نیشانەکەی بەم شێوەیە /4/، لەهەندێ حاڵەتی دووپات کردنەوەو سەرسوڕماندا بەکاردێت، ئاوازەکانی تریش بریتین لەئاوازەی نزم /1/و ئاوازەی ئاسایی /2/ و ئاوازەی بەرز /3/. |
| extra- oral | شفتاني، فمي خارجي | **لێوی، دەرەوەی زار:**<br>ئەو دەنگەیە کە لەپێشەوەی بۆشایی زاراوە دەر دەچێ، واتە لەهەردوو لێوەوە، وەکو /م، ب، پ،/ بڕوانە (bilabial) |

# - F-

| | | |
|---|---|---|
| falling diphthong | ثنصائت هابط | **ڤولی دوولانەی نزم:**<br>ـــەو ڤاوڵــە دوولانەیـــەی کــە لەســـەرەتادا میزمکەی بەرزو بەهێز دەبێت و لەکۆتاییدا میزمکە لاواز دەبێت وەکو /aw/ لەوشەی ـەو /daw/، /ay/ لەوشەی (چای) /ĉay/. |
| falling juncture | فاصل هابط | **هەڵوستەی نزم:**<br>فۆنیمێکی ناکەرتییە، نزم بوونەوەی ئاوازەی ـەگەڵدایەو نیشانەکەی بەم جۆرەیە /↙/.. ـەڵوەستەیەکی کۆتاییە پێش وەستان ـەکەوێت و دەکەوێتە کۆتایی ڕستەی هەواڵ یان ئەو ڕستە پرسەی بە بەڵێ و نەخێر وەڵام نادرێتەوە، هەروەها بەرامبەر بەهەڵوەستەی بەرز –rising juncture– دەوەستێت. |
| faucal= guttural | حلقي | **گەرووی (دەنگ):**<br>أ–ئـــەو دەنگەیـــە کـــە لـــەنێوان گـــەروو زمانۆچکەوە دەدرکێت.<br>ب–سیفەتە بۆ ئەو جۆرە دەنگە. |
| features | سمات | **سیماکان:**<br>بریتییە لەو تایبەتییە سەرەکییانەی یان لاوەکییانەی کە لەدەنگێکی زمانیدا هەیە. |
| final accent | نبرة ختامية | **هێزی کۆتایی:**<br>ئەو هێزەیە کە لەسەر دوابڕگەی وشەیەکدا دادەنرێت. |
| final contrast | تقابل ختامي | **بەرامبەری کۆتایی:**<br>ئـــەو دوو فۆنیمـــەی کـــە بەرامبـــەر بەیـــەك دەوەســـتن لـــەکۆتایی دوو وشـــەی جیـــاواز |

| | | |
|---|---|---|
| | | لەواتادا وەك: كەم : كەو، دەم: دەس. |
| final devoicing | اهماس ختامي | **كپ كردنى كۆتـايى:**<br>كپ كردنـى دەنگێكـى گڕ كاتێ كە دەنگەكە دەكەوێتە كۆتايى ئاخاوتنەوە. |
| final position | موقع ختامي | **شوێنى كۆتـايى:**<br>شوێنى دەنگ لەكۆتايى وشەدا، كە بەرامبەر بەشـوێنى سـەرەتاو شـوێنى ناوەڕاسـت دەوەستێ. |
| fixed accent= fixed stress | نبرة ثابتة | **هێزى چەسپاو:**<br>ئەو هێزە چەسپاوەيە كە لەسەر برگەيەكى ديـاريكراوى وشـەيەكدايە و ناچـێتە سـەر برگەيـەكى تـرەوە هـەر چـەندە ئـەركى يـان شـوێنى وشـەكە لەرستەدا بگۆڕێت، ئەمـەش بەرامبـەر بـەهێزى ئـازاد (free accent) دەوەستێت. |
| fixed stress | نبرة ثابتة | **هێزى چەسپاو:**<br>بڕوانە زاراوەى پێشوو. |
| flap | صوت مستل | **دەنگى وەرگێراو:**<br>١-دەنگێكـى گـيرى وەسـتاوە بـەخێرايى دەدركێت، وەكو [t]ى ئەمريكى كە دەكەوێتە نێوان دوو ڤاوڵەوە لەوشەى (water)دا.<br>٢-هـەر دەنگێك لەئەنجامى جووڵانەوەيـەكى زۆر خێراى هەر دركێنەرێك دروست بێت. |
| flapped sound | صوت مستل | **دەنگى وەرگێراو:**<br>بڕوانە زاراوەى پێشوو. |
| formant = physical element | العنصر المادي | **كەرەسەى فيزيكى ( مادى ):**<br>ئـەو كەرەسـە دەنگييـەى كـە لـەدەربڕينى |

| | | |
|---|---|---|
| | | زمانیدا بەکاردێت. |
| fortis sound | صوت شديد | **دەنگی توند:**<br>ئەو دەنگەیە کە گرژ بوونەوەیەکی زۆری ماسولکەکانی لەگەڵدایە، ئەمەش بەرامبەر بەدەنگی خاو lenis sound دەوەستێت. توندیش جیاوازی لەگەڵ گرژەوە بوو دا (tense) ئەوەیە کە دووەمیان تایبەتە بەڤاوڵەکان واتە بۆ دەنگی ڤاوڵ بەکاردێت، هەروەها جیاوازی خاو لەگەڵ نەرمدا (lax) ئەوەیە کە دووەمیان دیسانەوە تایبەتە بەڤاوڵەکان. |
| free accent | نبرة حرة | **هێزی ئازاد:**<br>ئەو هێزەیە کە دەکرێ بچێتە سەر هەر برگەیەك لەوشەدا بەپێی گەردان کردنی یان شوێنی دەرکەوتنی لەرستەدا ئەمەش بەرامبەر بەهێزی چەسپاو fixed stress دەوەستێت. |
| free alternant = free variant | متغير حر | **گۆراوی ئازاد:**<br>ئەو ئەلۆفۆنەی یان ئەلۆمۆرفەی کە دابەش دەبێت بێ ئەوەی مەرجەکانی ژینگەی لەسەر بێت. |
| free stress | نبرة حرة | **هێزی ئازاد:**<br>بڕوانە free accent. |
| free syllable | مقطع حر | **برگەی ئازاد:**<br>ئەو برگەیەیە کە کۆتایی بەڤاوڵ دێت، هەروەها بەبرگەی کراوە open syllable ناودەبرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| free variant | متغير حر | **گۆڕاوی ئازاد:**<br>ئەو ئەلۆفۆنەیە یان ئەلۆمۆرفەیە کە بەژینگەی دوروبەرییەوە بەند نییەو چەند شێوەیەك وەردەگرێت لەهەمان ژینگەدا، وەکو /ت/ لەوشەی (دێت) کە لەوانەیە هائی بێت یان بەندکراو بێت. |
| free variation | تغير حر | **گۆڕانی ئازاد:**<br>بڕوانە زاراوەی پێشوو |
| free vowel | صائت حر | **ڤاولی ئازاد:**<br>ئەو ڤاوڵەیە کە دەکەوێتە کۆتایی بڕگەوە، هەروەها پێی دەوترێ ڤاولی کراوە (open vowel). |
| frequency | تردد | **لەرەلەر:**<br>بریتیە لەژمارەی لەرەی شەپۆلەکانی دەنگ لەچرکەیەکدا. |
| fricative | احتكاكي | **خشۆکی (دەنگ):**<br>١-ئەو دەنگەی کە دروست دەبێت لە لێ خشانی تەزووی هەناسە بەلێواری بۆرییەکانی دەنگەوە لەئەنجامی ئەوەی کە تەگەرە دەخرێتە بەر بەشێکی تەزووەکەوە، ئەمەش یان خشۆکێکی ئاسۆیی دەبێت وەکو /ف، ڤ، ه/ یان خشۆکێکی ستونی دەبێت وەکو /س، ز، ش، ژ/.<br>٢-سیفەتە بۆ ئەو جۆرە دەنگە. |
| friction | احتكاك | **خشان:**<br>بریتیە لەخشانی تەزووی هەناسە بەلێواری بۆرییەکانی دەنگەوە بەتایبەتی لەناو زاردا، |

| | | |
|---|---|---|
| | | کەدەبێتــە هــۆی دروســت بــوونی دەنگــی خشۆك. |
| frictionless continuant | امتدادي غير احتكاكي | **بەردەوامی ناخشۆکی:** وەك زاراوەیــەك دەشــێ بــۆ ناولێنــانی هــەر ڤاوڵێــك یــان نیمچــە ڤاوڵێــك یــان هــەر کۆنســـنەنتێك بــەکاربێت، بێجگــە لەدەنگــە گیرەکان نەبێت. |
| frontal | أمامي | **پێشەوە (دەنگ):** ئــەو دەنگەیــە کــە لەلێکــەوتنی (تمــاس) پێشــەوەی زمــان لەگــەڵ مەڵاشــووی ڕەقــدا دروست دەبێت. |
| fronted sound | صوت مقدم | **دەنگی پێش خراو:** ئەو دەنگەی کەدروست دەبێت بەهۆی پێش خستنی شــوێنی بەیــەك گەیشــتنی زمــان لەگــەڵ مەڵاشــوودا لەشــوێنی دیــاریکراوی خۆیــدا، ئــەم جــۆرە پــێش خســتنەش لەئــەنجامی کــارتێکردنی دەنگــەکانی دەورو بـــەردا ڕوودەدات وەکـــو درکانـــدنی /ك/ لەوشەی (کێو)دا، لێرەدا سازگەی /ك/ لــەژێر کارتێکردنی /یٚ/ هاتۆتە پێشــەوەو لەشــوێنی ئاسایی خۆیدا نەدرکاوە. |
| fronting | تقدم | **پێش خستن:** بریتیــە لــەپێش خســتنی ســازگەی درکانــدنی دەنگێك لەســازگەی درکاندنی ئاسایی خۆی بەئاڕاســتەی هــەر دوو لێــو بــەهۆی بیئــەی دەنگـــی دەوروبـــەرەوە، بڕوانـــە زاراوەی پێشوو. |

| | | |
|---|---|---|
| front of the tongue | مقدم اللسان | **پێشەوەی زمان:** ئەو بەشەی زمانە کە دەکەوێتە نێوان نووکی زمان و ناوەڕاستی زمان، ئەم بەشەش بەشداری لەدرکاندنی دەنگەکانی زمان دەکات بەهۆی لێکەوتنی لەگەڵ مەلاشووی ڕەقدا. |
| fronto-palatal | غاري امامي | **مەلاشوی ڕەقی پێشەوە:** ئەو دەنگەی کە پێشەوەی زمان دەبێتە درکێنەرو مەلاشوی ڕەقیش وەك سازگەی درکاندن بەشداری تێدا دەکات وەکو /ج، چ، ش، ژ/. |
| fronto-palatal affricate | مزجي غاري أمامي | **تێکەلاوی مەلاشوی ڕەقی پێشەوە:** دەنگێکی تێکەلاوە پێشەوەی زمان و مەلاشوی ڕەق بەشداری لەدرکاندنی دەکەن، وەکو /ج، چ/ |
| front- palatal glide | انزلاقي غاري أمامي | **نیمچە ڤاولی مەلاشوی ڕەقی- پێشەوە:** ئەو نیمچە ڤاولەی کە پێشەوەی زمان و مەلاشووی ڕەق بەشداری لەدرکاندنی دەکەن، وەك /ی/ لەوشەی (یار)دا. |
| front vowel | صائت أمامي | **ڤاولی پێشەوە:** ئەو ڤاوڵەیە کە لەکاتی درکاندنیدا زمان لەبەشی پێشەوەی بۆشایی زاردا دەبێت، وەکو /ی، ێ، ‡ بزرۆکە/. |
| full stress | نبرة رئيسية | **هێزی سەرەکی:** بڕوانە primary stress. |
| functional change | تحول وظيفي | **گۆڕانی ئەرکی:** بریتیە لەگۆڕانی پەیڕەوی فۆنیمی زمانێك بەپێی پێداویستی ئەرکی زمانەکە. |

| | | |
|---|---|---|
| functional difference | فرق وظيفي | **جیاوازی ئەرکی:**<br>ئەو جیاوازییەی کە لەنێوان دەنگەکانی زماندا هەیەو دەبێتە هۆی گۆڕانی واتا، وەکو جیاوازی نێوان /ب/ و /پ/ لەوشەی (بار) و (پار)دا، ئەم جیاوازییەش بەکاردێت بۆ سەلماندنی فۆنیمیەتی دەنگەکانی زمان. |
| functional load | عبء وظيفي | **ئەرکی لە ئەستۆگرتن:**<br>بریتییە لەژمارەی ئەو جووتە وشانەی لەزمانێکدا هەن کە دوو فۆنیمیان تێدا بەرامبەر بەیەك دەوەستن، بۆ نموونە ئەرکی لەئەستۆگرتنی /ت/ و /ك/ بریتییە لەژمارەی ئەو جووتە وشانەی کە /ت/ و /ك/ی تێدا بەرامبەر بەیەك دەوەستن وەکو /تەم: کەم/. لەڕاستیدا ئەرکی لەئەستۆگرتن لەبارێکەوە بۆ بارێکی تر هەروەها لەزمانێکەوە بۆ زمانێکی تر دەگۆڕێت. |
| functional phonetics | علم الاصوات الوظيفي | **فۆنەتیکی ئەرکی:**<br>بڕوانە زانستی فۆنیمەکان (phonemics). |
| fundamental frequency | تردد اساسي | **لەرەلەری سەرەکی:**<br>بریتیە لە لەرەلەری شەپۆلێکی دەنگی ئاڵۆز. |
| fundamental tone=note | نغمة اساسية | **ئاوازەی سەرەکی:**<br>ئاوازەیەکی سەرکییە زاڵ دەبێتە سەر زنجیرە ئاوازەیەکی گونجاو کە هاوکات لەگەڵیدا دەبێت. |
| furtive vowel | صائت مختلس | **ڤاوڵی ونبوو (بزرکراو)** |

## - G -

| | | |
|---|---|---|
| geminated sound | صوت مضعف | **دەنگی دووبارەکراوە:**<br>بڕوانە زاراوەی gemination. |
| gemination | تضعيف | **دووبارەکردن:**<br>بۆ ئەم مەبەستانە بەکاردێت:<br>أ-دووبارە کردنەوەی پیتێك دوا بەدوای یەك لەوشـــەیەکدا، وەك پیتـــی (ل) لەوشـــەی (میللەت)دا.<br>ب-درێژکردنەوەی دەنگ.<br>ج-درێژکردنـــەوەی مـــاوەی بەنـــدکردنی دەنگێك ئەگەر هاتوو دەنگەکە گیربوو. |
| genemmic phonetics | علم الاصوات الفيزيائي | **فۆنەتیکی فیزیکی:**<br>ئـــەو زانســـتەیە کـــە لەدەنگـــەکانی زمـــان دەکۆڵێتەوە پاش درکاندنیان، واتە دیراسەی ئـــەو دەنگانـــە دەکـــات لـــەڕووی ڕواڵـــەت و ناوەڕۆك و چۆنیەتی دروست بوونی شـەپۆلی دەنـــگ و چـــۆنیەتی گواســـتنەوەی ئـــەو شەپۆلانە بۆ گوێ لەگەڵ ئەو هۆکارانەی کە کاریـــان تێدەکـــەن، هـــەروەها بـــە physical phonetics ناودەبرێت. |
| general phonetics | علم الاصوات العام | **فۆنەتیکی گشتی:**<br>ئـــەو زانســـتەیە کـــە لەدەنگـــەکانی زمـــان دەکۆڵێتـەوە بەشێوەیەکی گشتی بیٚ ئەوەی خـــۆی بەدەنگـــەکانی زمانێـــك ببەســـتێتەوە، ئەمـــەش بەرامبـــەر بەفۆنـــەتیکی تایبـــەتی particular phonetics دەوەستێت. |

| | | |
|---|---|---|
| genetic phonetics | علم الاصوات التاريخي | **فۆنەتیکی مێژوویی:**<br>بڕوانە diachronic phonetics |
| gingival = alveolar | لثوي | **پووکی (دەنگ):**<br>ئەو دەنگەیە کە لەئەنجامی لێکەوتنی (تماس) نووکی زمان لەگەڵ پووکی ناوەوەی دانەکانی سەروو دروست دەبێت. |
| glide = semi-vowel | انزلاقي<br>شبه صائت | **خلیسکاو- (نیمچە ڤاوڵ):**<br>ئەو دەنگەیە کە وەکو ڤاوڵ دەدرکێ و وەکو کۆنسنەنت دابەش دەبێت، وەکو /w/ و /y/ی نیمچە ڤاوڵ لەزمانی کوردیدا. |
| gliding sound | صوت انزلاقي | **دەنگی خلیسکاو:**<br>بڕوانە زاراوەی پێشوو. |
| gliding vowel (sime_vowel) | صائت انزلاقي | **ڤاوڵی خلیسکاو:**<br>بڕوانە زاراوەی: glide. |
| glossogram = linguagram | رسم اللسان | **وێنەی زمان:**<br>ئەو وێنەیەی کە شوێنی لێکەوتنی (تماس) زمان بەزاراوە نیشان دەدات لەکاتی درکاندنی دەنگێك لەدەنگەکانی زمان. |
| glossolalia | قدرة لسانية | **توانای زمانی:**<br>ئەو توانایەی کە مرۆڤ هەیەتی بۆ بەکارهێنانی زمان لەدرکاندنی دەنگەکاندا. |

| | | |
|---|---|---|
| glottal-larngneal | حنجري | **قورگی (دەنگ):**<br>ا-ئـەو دەنگـەی لەقورگـەوە دەردەچـێ، لەئەنجامی بەیەکاھاتنی (داخستنی) یان تەسك بوونەوەی ژێیەکانی قورگ دروست دەبێت، ئەم کارەش دەبێتە هۆی ڕێگرتنی یان ڕاگرتنی تەزووی هەناسە.<br>ب-سیفەتە بۆ ئەو جۆرە دەنگە. |
| glottal accent | نبر حنجري، نبر همزي | **هێزی قورگی (هەمزەیی):**<br>گرژبوونـەوەی قـورگ لەگـەڵ دركانـدنی ڤاوڵـدا بـەجۆرێك لەدركانـدنی دەنگـی هەمزە بچێت. |
| glottal catch | همزة محققه | **هەمزەی تەواو:**<br>جووڵانـەوەی قـورگ لـەکاتی دركانـدنی دەنگێکـی گـیر (وەسـتاو) لەسـەرەتای وشەدا. |
| glottal fricative | احتكاكي حنجري | **خشۆکی قورگی:**<br>ئـەو دەنگـە خشـۆکەی کـە لەئـەنجامی خشانی تەزووی هەناسە لەگەڵ ژێیـەکانی قورگـدا دەردەچـێت لەدەرچـەی زورنـادا وەکو /ھ/. |
| glottal friction | احتكاك حنجري | **لێ خشانی قورگی:**<br>بریتیـە لەشـێوەی دركانـدنی دەنگێکـی خشۆکی قورگی، بڕوانە زاراوەی پێشوو. |
| glottal hard catch | همزة قطع | **هەمزەی دابڕ:**<br>ئـەو هەمزەیـەی کـە لەسـەرەتای یـان |

| | | |
|---|---|---|
| | | ناوەڕاستی وشەدا دەردەکەوێت لەهەموو حاڵەتێکیشدا دەنووسرێت و دەدرکێت، واتە وشەکە چی لەسەرەتا یان ناوەڕستی ڕستەدا بێت، لەکوردیدا هەمزە لەسەرەتای وشەدا دەردەکەوێت و لەناوەڕاست و کۆتایدا بەدەگمەن دەردەکەوێ. |
| glottalic closure | انغلاق حنجري | **داخستنی قوڕگ:**<br>داخستنی قوڕگ و ڕێگرتنی لەتەزووی هەناسە هەر وەکو لەدرکاندنی دەنگی هەمزەدا ڕوودەدات. |
| glottalization | اهماز | **بەهەمزەکردن:**<br>زاڵ بوونی سیمای هەمزەیی بەسەر دەنگێکدا. |
| glottalized | مهموز | **بەهەمزەکراو:**<br>سیفەتە بۆ ئەو دەنگەی کەسیمای هەمزەیی بۆ زیاد دەکرێت لەئەنجامی ئەو پاڵە پەستۆیەی کە دەکرێتە سەر دەرچەی زوڕنا و داخستنی ژێیەکانی قوڕگ. |
| glottalized sound | صوت مهموز | **دەنگی بەهەمزەکراو:**<br>بڕوانە زاراوەی پێشوو. |
| glottal soft catch | همزة وصل | **هەمزەی گەیەنەر:**<br>ئەو هەمزەیەی کە بەکار دێت بەمەبەستی ڕزگاربوون لەدرکاندنی دەنگێکی وەستاو |

| | | |
|---|---|---|
| | | لەسەرەتای وشەدا، ئەمەش تەنیا لەسەرەتای وشەدا دەدرکێت، ئەگەر بێتو وشەکە لەسەرەتای ئاخاوتندا بێت، بەڵام کە وشەکە لەناوەڕاستی ئاخاوتندا بێت هەمزەی گەیەنەر ئەلفەکەی دەنووسرێ بێ ئەوەی بدرکێ، ئەم جۆرە هەمزەیەش لەکوردیدا نییە. |
| glottal stop | انفجاري حنجري | **گیری قوڕگی:** ئەو دەنگەی کە دەرچەی زوڕنای لەگەڵدا دادەخرێ، پاشان لەپڕ هەواکە بەرەڵا دەکرێ، ئەم کارەش دەبێتە هۆی دروست بوونی هەمزەی دابڕ. |
| glottis | مزمار | **دەرچەی زوڕنا:** ئەو دەرچەیەی کە لەنێوان ژێیەکانی قوڕگدایەو دەکەوێتە سەرووی قوڕگەوە. |
| graph | حرف | **پیت:** هێمایەکی نووسینە گوزارشت لەتاکە دەنگێکی زمانی دەکات. |
| grapheme | غرافیم، (حرف مجرد) | **گرافیم، (پیتی ئەبستراکت):** هێمایەکی ئەبستراکتە بۆ دەنگێکی زمانی، هەندێ جار هێما هەیە چەند شێوەیەکی جیاواز وەردەگرێت، بەپێی شوێنی دەرکەوتنی لەسەرەتاو ناوەڕاست و کۆتایی وشەدا، وەکو پیتی (ی) کە لەسەرەتای وشە (یـ)و لەناوەڕاستدا (ـیـ) |

| | | |
|---|---|---|
| | | لەکۆتایش (ی) هەر شێوەیەك لەو شێوانە بە ئەلۆگراف allograph ناودەبرێت. |
| graphem-phoneme correspondence | تماثل الغرافيمات والفونيمات | **ویکچوونی گرافیمەکان و فۆنیمەکان:** ١-ئەوەیە کە هەر گرافیمێك هێما بۆ تاکە فۆنیمێك بکات لەپەیڕەوی نووسینی زمانێکدا، هەر وەکو ئەوەی کە لەزمانی کوردیدا هەیەو بەکاردێت. ٢-بریتیە لەهاوتا بوونی شێوەی نووسینی وشەیەك لەگەڵ درکاندنیدا وەکو وشەی (سارد) چۆن گۆدەکرێت ئەواش دەنووسرێت. |
| graphemics | دراسة الغرافيمات | **دیراسەکردنی گرافیمەکان:** بریتیە لەدیراسەکردنی سیستەمەکانی نووسین. |
| graphic mark | علامة كتابية | **نیشانەی نووسین:** بڕوانە (diacritic mark). |
| graphic medium | واسطة كتابية | **هۆکاری نووسین:** نووسین وەك ڕێگەیەك یان هۆیەك بەکاربێت بۆ دەربڕینی زمان، ئەمەش بەرامبەر بەهۆکاری سەرزاری دەوەستێت کە ئاخاوتنە. |
| graphic-phonemic correspondence | تماثل كتابي فونيمي | **ویکچوونی نووسینی فۆنیمی:** هێماکانی نووسینی وشەیەك کەهەمان هێماکانی نووسینی فۆنیمی وشەکە نیشان بدات، وەکو (دارا) کە بەهەمان |

| | | |
|---|---|---|
| | | شــــێوەی نووســــینی فــــۆنیمی /دارا/ دەنووسرێ. |
| graphics | دراسة الغرافيمات | **دیراسەکردنی گرافیمەکان:** بڕوانە زاراوەی: graphemics. |
| graphic sign | رمز حرفي | **هێمای پیتی:** بڕوانە (graphic symbol). |
| graphic substance | مادة كتابية. | **کەرەسەی نووسین:** ئەو پیتە ئاساییانەی کە زمانێکی پێ بنووسرێ. ئەمەش بەرامبەر بەکەرەسەی دەنگی زمانەکە دەوەستێ. |
| graphic symbol | رمز حرفي | **هێمای پیتی:** بریتیە لەهێمای نووسینی ئاسایی کە لەپیتەکان پێك دێت، ئەمەش لەنێوان دوو نیشانە بەم شێوە < > دەنووسرێ بۆ ئەوەی لەنیشانەکانی دەنگ و فۆنیم و مۆرفیم جیا بکرێتەوە کە بەم شێوەیە دەنووسرێن [ ]، / /، { }. |
| graphonomy | دراسة الغرافيمات | **دیراسە کردنی گرافیمەکان:** بڕوانە زاراوەی graphemics. |
| grave | منخفض التردد | **لەرەلەری نزم:** ئەو لەرەلەرەی کە بەرامبەر بە لەرەلەری بەرز acute دەوەستێت. |
| grave accent | نبرة خفيضة | **هێزی نزم:** ئەو هێزەیە کە بەهێزی سێیەم tertiary یان لاواز weak ناو دەبرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| groove fricative | احتكاكي راسي | **خشۆکی ستونی:**<br>دەنگێکی خشۆکە کاتێ دروست دەبێت کە ڕێڕەوی هەوا لەناو زاردا لەسەر باری ستونی فراوان دەبێت و لەسەرباری ئاسۆیش تەنگ دەبێتەوە وەکو /س، ز، ش، ژ/ ئەمەش بەرامبەر خشۆکی ئاسۆی slitfricative دەوەستێ وەکو /ف، ڤ/. |
| gum | لثة | **پووك:**<br>ئەندامێکە لەئەندامانی درکاندن دەبێتە سازگەی درکاندنی دەنگە پووکییەکان کاتێ کە نووکی زمانی لێدەکەوێت یان لێی نزیك دەبێتەوە وەکو /ت، د، س، ز، ل، ر، ن/. |
| gum- ridge | اعلى اللثة | **سەرووی پووك:** |
| guttural = pharyngeal | حلقي | **گەروویی ( دەنگ ):**<br>ا-ئەو دەنگەی کە سەرچاوەکەی گەرووە، وەك /ق، ح، ع/.<br>ب-سیفەتە بۆ ئەو جۆرە دەنگە.<br>ج-سیفەتە بۆ گەروو. |
| guttural sound | صوت حلقي | **دەنگی گەروویی:**<br>بڕوانە زاراوەی پێشوو (أ). |

# - H -

| | | |
|---|---|---|
| half- close vowel | صائت نصف ضيق | **ڤاوڵی نیمچە داخراو ( تەنگ ):**<br>ئەو ڤاوڵەیە کە لەکاتی درکاندنیدا باری زمان نزیک دەبێتەوە لەو بارەی کەڤاوڵی تەنگی پێ دەدرکێت، بەڵام زار بەرادەیەکی کەم لەگەڵیدا دەکرێتەوە. واتە زمان لەسەر بارێکی ناوەندی دەبێت لەنێوان ئەو بارەی کە ڤاوڵی تەنگ و ئەو بارەی کە ڤاوڵی فراوانی تێدایە، کرانەوەی زاریش لەبارێکی ناوەند دەبێت، هەروەها ڤاوڵی نیوە تەنگ بەڤاوڵی ناوەند mid vowel ناو دەبرێت، /ۆ، ێ،/یش نموونەی ئەم جۆرە ڤاوڵەیە. |
| half- long vowel | صائت نصف طويل | **ڤاوڵی نیمچە درێژ:**<br>ڤاوڵێکی ناوەندییە لەنێوان کورت و درێژدا. |
| half- open vowel | صائت نصف متسع | **ڤاوڵی نیمچە کراوە:**<br>ئەو ڤاوڵەیە کە لەکاتی درکاندنیدا باری زمان نزیک دەبێتە لەو بارەی کە ڤاوڵی کراوەی پێ دەدرکێت، کرانەوەی زاریش زیاتر دەبێت لەوەی کە لەڤاوڵی نیمچە داخراودا دەکرێتەوە، کەمتر دەکرێتەوە لەوەی کە لەڤاوڵی کراوەدا دەکرێتەوە، نموونەی ئەم ڤاوڵەش /a/. |
| haplology | اختزال صوتي | **کەوتن ( لابردنی ) دەنگ:**<br>ا-لابردنی دەنگێک لەدوو دەنگی لێکچووی دوابەدوای یەکدا وەک:<br>چاک کردن > چاکردن. |

| | | |
|---|---|---|
| | | ب-لابردنـــی دەنگێــك لـــە وشـــەیەکدا بەمەبەســتی ئاسـانی درکانـدن. دابنیشــە > دانیشە. |
| **hard = non-palatalized** | **غیر مفور** | **بەر مەلاشوو نەدراو:**<br>بڕوانە زاراوەی (**palatalized**). |
| **hard consonant** | **صامت غیر مفور**<br><br>**صامت مهموس** | **١-کۆنسنەنتی بەر مەلاشوو نەدراو:**<br>ئـەو کۆنسـنەنتەیە کـە پێشـەوەی زمـان یـان ناوەڕاستی زمان ئالکێ بەمەلاشووی ڕەقەوە.<br>**٢-کۆنسنەنتی کپ (بێ ژێ):**<br>بڕوانە زاراوەی: **voiceless**. |
| **hard palate** | **الغار، الحنك الصلب** | **مەلاشووی ڕەق:**<br>بەشـی پێشـەوە لـەدیوی سـەرەوەی نـاو زار دەگرێتەوە واتە بنمچی زار ئەم بەشەش ڕەقە بـە بـەراورد کـردن لەگـەڵ بەشـی پشـتەوەی کـەپێی دەوتـرێ مەلاشـووی نـەرم **soft palate**. مەلاشـــــووی ڕەق بەشـــــداری لەدرکانـدنی دەنگـەکانی زمـان دەکـات، کـاتێ کـەزمان لێـی دەکـەوێت یـان لێـی نزیـك دەبێتـــەوە، ئـــەو دەنگانـــەش بـــەدەنگی مەلاشوویی ناو دەبرێن، وەکو /س، ز، ج، چ، ی- نیمچە ڤاول/ |
| **harmonic** | **نغمة توافقیە** | **ئاوازەی گونجاو (هارمۆنی):**<br>ئەو ئاوازەیـەی کـە لەرەلەرەکـەی یەکێکـە لـەو دوو ئەوەندەیــەی (موزاعــەفاتی) لەرەلــەری ئاوازەی سەرەکی. |
| **harmonic series** | **متسلسلة توافقیة** | **زنجیرە هارمۆنی:**<br>زنجـیرە ئاوازەیەکــە کــە ڕێــژەی نێــوان |

| | | |
|---|---|---|
| | | لەرەلـــەرەکانی بـــەم شـــێوەیەیە ١: ٢: ٣......هتد. |
| **harmonious** | **متناغم** | **هارمۆنی گونجاو (ڕاهاتوو):**<br>سیفەتە بۆ ئاوازەیەك کە لەگەڵ ئاوازەیەکی تردا بگونجێت و ڕابێت. |
| **harmony** | **ایقاع،تناغم تآلف** | **١-تـرپە، (هارمۆنی):**<br>**٢-ڕاهاتن (گونجان):**<br>گونجانی سیماکانی ئاخاوتن، لەڕووی هێزو ئاوازەو دەنگەکانیەوە بەجۆرێك کە کار بکاتە سەر دەروونی گوێگرو ئاوازەکەی لا پەسەند بێت. |
| **head cavity** | **تجویف راسي** | **بۆشایی سەر:**<br>مەبەست لەو بۆشاییانەیە کە لەناو سەردا هەیە، وەکو بۆشایی لووت و بۆشایی زار. |
| **heavy stress** | **نبرة رئیسیة** | **هێزی سەرەکی:**<br>فۆنیمێکی ناکەرتییە هێماکەی بەم شێوەیەیە /ˊ/. |
| **heterographic spelling** | **تهجئة مغایرة** | **جینجەکردنی جیاواز:**<br>ئـەو پیتـەی کـە چـەند دەنگێکـی جیـاواز بنـوێنێ لەچـەند وشـەیەکی جیـاوازی زمانێکـدا، وەکـو پیتـی <o> لـەزمانی ئینگلیزیدا کە /a/ی دەنوێنێ لەوشەی (hot) و /i/ی دەنوێنێ لەوشەی (women)دا. |
| **heterography** | **کتابة متغایرة** | **نووسینی جیاواز:**<br>ئـەو نووسـینەیە کەتێیـدا پیتێـك چـەند فـۆنیمێکی جیـاواز دەنـوێنێ لەچـەند وشـەیەکی جیـاوازی زمانێکـدا. ئـەم جـۆرە نووسـینەش |

| | | |
|---|---|---|
| | | دەبێتە هۆی پەیدابوونی چەند وشەیەك كە یەك واتایان هەبێت یان یەك گۆكردنیان هەبێت، بەڵام بەحینجەكردنی جیاواز دەنووسرێن وەكو fair و fare لەزمانی ئینگلیزیدا. |
| heteronomous sound chang | تغيير صوتي مشرط | **گۆڕانی دەنگی مەرجدار:** بڕوانە conditioned sound chang. |
| heteronym | مخالفة صوتية | **پێچەوانەیی دەنگی:** وشەیەك حینجەكەی (نووسین) لەگەڵ وشەیەكی تردا هاوتابن، بەڵام لەواتاو گۆكردندا پێچەوانەی یەك بن، وەكو وشەی (هەمانە) بەواتای (كیسە) دێت و (هەمانە) بەواتای (ئێمە هەمانە) دێت. |
| heteronymy | مخالفة صوتية | **پێچەوانەیی دەنگی:** دوو وشە لەحینجەكردندا هاوتابن، بەڵام لە واتاو گۆكردندا جیاواز بن بڕوانە زاراوەی پێشوو. |
| hiatus | تضعيف الصائت | **دووبارەكردنەوەی ڤاوڵ:** دووبارەكردنەوەی هەمان ڤاوڵ بەدوای یەكدا لەوشەیەكدا. |
| high back round vowel | صائت مدور خلفي عال | **ڤاوڵی خڕی بەرزی پشتەوە:** وەكو /و/ لەوشەی (كوڕ)دا. |
| high back vowel | صائت خلفي عال | **ڤاوڵی بەرزی پشتەوە:** وەكو /و/. |
| high central unround vowel | صائت غير مدور مركزي عال | **ڤاوڵی ناخڕی بەرزی ناوەند:** وەكو /ɨ/ لەوشەی (ژن- žɨn )دا |

| | | |
|---|---|---|
| high central vowel | صائت مركزي عال | **ڤاولی بەرزی ناوەند:**<br>وەکو / ɨ /ی بزرۆکە. |
| high-frequency sound | صوت عال الشيوع | **دەنگی زۆرباو:**<br>دەنگێك کە بەکارهێنانی زۆرباو بێت لەزمانێکدا. |
| high front unround vowel | صائت غير مدور امامي عال | **ڤاولی ناخری بەرزی پێشەوە:**<br>وەکو /ی/ لەوشەی (شیر). |
| high front vowel | صائت امامي عال | **ڤاولی بەرزی پێشەوە:**<br>وەکو /ی/. |
| high pitch | نغم عال | **ئاوازەی بەرز:**<br>فۆنیمێکی ناکەرتییە هێماکەی بەم جۆرەیە /3/، یەکێکە لەو چوار ئاوازەیەی کە بریتین لە: ئاوازەی نزم /1/ و ئاوازەی ئاسایی /2/ و ئاوازەی بەرز /3/و ئاوازەی سەرووی بەرز /4/. |
| high vowel | صائت عال | **ڤاولی بەرز:**<br>ئەو ڤاوڵەیە کە لەکاتی درکاندنیدا زمان لەناو بۆشایی زاردا بەرز دەبێت و کرانەوەی زارش کەم دەبێت. لەبەر ئەوە پێی دەوترێ ڤاولی داخراو (تەنگ) close vowel وەکو /و، ی، ɨ /، ئەمەش بەرامبەر بە ڤاوڵی ناوەڕاست mid vowel و ڤاوڵی نزم low vowel دەوەستێ. |
| hissing sound | صوت هسيسي | **دەنگی سیکەیی:**<br>جۆرێکە لەدەنگە فیکەییەکان وەکو /س، ز/ بڕوانە sibilant. |

| | | |
|---|---|---|
| historical phonetics | علم الاصوات التاريخي | **فۆنەتیکی مێژوویی:**<br>بڕوانە diachronic phonetics. |
| homogram | مشترك كتابي | **هاوپیت:**<br>وشەیەك لەگەڵ وشەیەکی تردا لەحینجەکردندا (نووسین) وەك یەك بن، بەڵام لەواتادا یان لەنەژادا یان لەگۆکردندا جیاواز بن، وەکو وشەی (شیر) کە بەواتای (شیری خواردن)و (شمشیر) دێت. |
| homograph | مشترك كتابي | **هاوپیت:**<br>بڕوانە زاراوەی پێشوو. |
| homographic spelling | تهجئة متجانسة | **حینجەکردنی (نووسینی) هاوچەشن:**<br>سیستەمێکی نووسینە کە هەر پیتێك تەنیا بۆ فۆنیمێك دادەنرێت، واتە هەر فۆنیمێك تەنیا بەپیتێك نیشان دەدرێت، تارادەیەك ئەم سیستەمە لەنووسینی کوردیدا پەیڕەو دەکرێت. |
| homography | مشترك كتابي<br><br><br><br><br><br>تهجئە متجانسة | **١-هاوپیت:**<br>دوو وشە لەحینجەکردندا (نووسین) هاوتابن بەڵام لەواتادا جیاواز بن، وەکو وشەی (بیر) بەواتای (چاڵ) و (بیرکردن) دێت. ئەمەش بەرامبەر بەهاوبێژی homophone دەوەستێت.<br>**٢-حینجەکردنی هاوچەشن:**<br>بڕوانە زاراوەی پێشوو. |
| homonym = homophone | مشترك لفظي | **هاوبێژی:**<br>وشەیەك لەگەڵ وشەیەکی تردا لەگۆکردندا هاوتابن، بەڵام لەواتاو حینجە کردندا |

| | | |
|---|---|---|
| | | (نووسین) جیاواز بن، ئەمەش لەکوردیدا نییە، چونکە وشە چۆن گۆ دەکرێت ئاواش دەنووسرێت، بەڵام لەزمانی ئینگلیزیدا هەیە وەکو (meat) بەواتای گۆشت (meet) بەواتای ژووان دێت. ئەم زاراوەیەش بەرامبەر بەهاوپیت homograph دەوەستێت. |
| homonymy = homophony | اشتراك لفظي | **هاوبێژی:**<br>بڕوانە (homonym). |
| homorganic sounds | اصوات مشتركة | **دەنگە هاوبەشەکان:**<br>دوو دەنگ یان زیاتر کە لەهەمان سازگەدا بەشداری بکەن، واتە یەك سازگەیان هەبێت، وەکو /ب، م/ و /گ، ك/ /د، ت/. |
| human language | لغة الانسان | **زمانی مرۆڤ:**<br>بریتیە لەزمانی دەنگەکانی ئاخاوتن کە مرۆڤ لەگیانلەبەرانی تر جیادەکاتەوە، ئەمەش بەرامبەر بەزمانی ئاژەڵ animal language- دەوەستێت. |
| hushing sound | صوت هشيشي | **دەنگی شیکەیی:**<br>دەنگێکی فیکەیی یە، لەگەڵ درکاندنی ئەم دەنگەدا ڕێڕەوی هەوا زیاتر دەکرێتەوە لەوەی کە لەدەنگە سیکەییەکاندا دەکرێتەوە، هەواش بەهەر دوولای زاردا دابەش دەبێت، و دەردەچێ وەکو /ش/، /ژ/، هەروەها بەدەنگێکی فیکەیی بەر مەڵاشوودراو palatalized sibilant ناودەبرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| hyper-urbanism | تقعر في اللفظ | **زیادڕۆیی لەگۆکردن:**<br>گـۆکردنی وشـەیەك بـەوردی و بەدیقـەت بەتایبـەتی لـەو شـێوە نووسـراوەی کـە هەیەتی. وەکو گۆکردنی پیتـی (t) لەوشـەی (often)ی ئینگلیزیدا. |
| hypophonemic system | نظام تحت فونيمي | **سیستەمی ژێرمووەی فۆنیم:**<br>بریتیـە لەسیسـتەمی دەنگـی یـان ئـەلۆفۆنی زمانێـك، ئـەم سیسـتەمەش شـێوەی دابەشـکردنی ئەلۆفۆنـەکانی کـە سـەر بەفۆنیمەکانی زمانەکەن دەستنیشان دەکات |

## - I -

| | | |
|---|---|---|
| iconograph | ايقنه<br><br><br><br>دیراسة الأيقونات | **١-ئەیکۆن:**<br>ئەو وێنانەی کە لەسەر شت و مەکی هەست پێکـــراو دەکێشـــرێو وەك ڕێگەیـــەکی سەرەتایی بۆ نووسین بەکار دێت.<br>**٢-دیراسەکردنی ئەیکۆنەکان** |
| ideal alphabet | ا بجدية مثالية | **ئەلفوبێی نموونەیی:**<br>ئەو ئەلفوبێیەیە کەتێیدا هەر پیتێك هێما بۆ تاکە فۆنیمێـك دەکـات و هـەر فـۆنیمێکیش تەنیا بەپیتێك نیشان دەدرێت، هەروەها پێـی دەوتـرێ perfect alphabet یـان ئـەلفوبێی دەنگی phonetic alphabet. |
| ideogram | رمز فكري<br><br><br><br>رمز مفرداتي | **١-هێمای بیری:**<br>هێمایـــەکی نووســـینە گوزارشـــت لـــەبیرێك دەکـــات، وەك لەنووســـینی هیرۆگلـــۆفی و نووسینی چینیدا هەیە.<br>**٢-هێمای وشەیی:**<br>ئـەو هێمایـەی یـان پیتـەی کـە گوزارشـت لەوشـەیەکی تـەواو دەکـات، وەکـو & کـە بـەواتای and دێـت و $ کـە بـەواتای دۆلار دێت. |
| ideograph | رمز فكري<br>رمز مفرداتي | **١-هێمای بیری:**<br>**٢-هێمای وشەیی:**<br>بڕوانە زاراوەی پێشوو. |
| ideographic writing | كتابة فكرية | **نووسینی بیری:**<br>بڕوانە زاراوەی پێشوو. |

| | | |
|---|---|---|
| idiophone | صوت شخصي | **دەنگی تاکە کەس:**<br>دەنگێکی زمانییە تایبەتە بەتاکە کەسێك، هیچ کەسێك لەو دەنگەدا بەشداری لەگەڵدا ناکات بەتایبەتی ئەوانەی کە بەهەمان زمان یان شێوە زار دەدوێن. |
| implosion | انفجاري داخلي | **گیری ( تەقیوی ) ناوەوە:**<br>بڕوانە زاراوەی پاشەوە (implosive). |
| implosive | انفجاري داخلي | **گیری ( تەقیوی ) ناوەوە:**<br>ئەو دەنگەی هەوای لەگەڵدا هەڵدەمژرێ بەرەو گەروو پاش داخستنی ژێیەکانی قورگ و کشانەوەی زمانۆچکە بەرەو خوارەوە، ئەمەش دەبێتە هۆی پەیدابوونی بۆشاییەکی زۆر کەم لەسەرووی زمانۆچکەوە، ئەم دەنگەش لەماچ کردن دەچێت. |
| implosive articulation | نطق جاذب | **درکاندنی ڕاکێشراو ( هەڵمژین ):**<br>درکاندنی دەنگێك لەگەڵ هەڵمژینی هەوا بەرەو ناوەوەی زار، ئەمەش دەبێتە هۆی دروست بوونی دەنگێك کە لەماچ کردن دەچێت، بڕوانە زاراوەی پێشوو. |
| implosive stop | انفجاري داخلي | **گیری ( تەقیوی ) ناوەوە:**<br>بڕوانە implosive. |
| impressioni-stic transcription | كتابة انطباعية | **نووسینی سەرەتایی ( انطباعي ):**<br>بریتییە لەنووسینی دەنگی یان فۆنیمی سەرەتایی زمانێك کە لێکۆڵەر هەوڵدەدات شارەزای سیستەمی دەنگی یان فۆنیمی ئەو زمانە بێت. |

| | | |
|---|---|---|
| inaudible | غير مسموع | **نەبیستراو:**<br>سیفەتە بۆ ئەو ئاخاوتنەی کە لەناخەوە ئەنجام دەدرێت کاتێ مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا بدوێ یان بەهۆی ئەوەوە بیر بکاتەوە بێ ئەوەی شەپۆلە دەنگ دروست بکات و خەڵکی گوێی لێ بێت. |
| infection | عدوى صوتية | **کارتێکردنی دەنگی:**<br>گۆڕانی دەنگێکی زمانی بەکارتێکردنی دەنگێکی دەوروبەر ئەم کارتێکردنەش دەبێتە هۆیەك بۆ گونجانی assimilation یان نەگونجانی dissimilation دەنگەکان. |
| infra-structure | تركيب تحتي | **ڕۆنانی ژێرەوە:**<br>ئەو ڕیزە فۆنیمە کەرتییانەیە کە دوا بەدوای یەك لەوشەیەکدا یان ڕستەیەکدا دەردەکەون ئەمەش بەرامبەر بەڕۆنانی سەرەوە superstructure دەوەستێ، کە بریتییە لەزنجیرەیەك لەفۆنیمە ناکەرتییەکان و لەگەڵ فۆنیمە کەرتییەکاندا دەردەکەون. |
| ingressive air | هواء داخل | **هەڵمژینی هەوا:**<br>ئەو هەوایەی کە دەچێتە ناو سییەکانەوە بەڕێگای ئەندامانی درکاندنەوە، لەکاتی چوونە ژوورەوەی هەوادا بەدەگمەن کردەی ئاخاوتن ئەنجام دەدرێت، چونکە لەزۆربەی زمانەکاندا هیچ دەنگێکی زمانی دروست نابێت لەکاتی هەناسە وەرگرتندا. |
| ingressive stop | انفجاري امتصاصي | **گیری ڕاکێشراو (هەڵمژین):**<br>ئەو دەنگە گیرەیە کە لەکاتی درکاندنیدا پاڵ |

| | | |
|---|---|---|
| | | بەهەواوە دەنرێت بەرەو سییەکان، هەروەها بە suction stop ناو دەبرێت کە دەنگی گیری دەرکراو egressiv stop بەرامبەری دەوەستێت. |
| inlalation = inspiration | شهيق | **هەناسە وەرگرتن:** چوونە ژوورەوەی هەوا لەدەرەوە بۆ ناو سییەکان لەکاتی کردەی هەناسەداندا. هەناسە وەرگرتنش بۆ کردەی ئاخاوتن زۆر پێویستە چونکە ئاخاوتن بەهەناسە وەرگرتن دەست پێ دەکات و ئەندامەکان ئامادە دەبن بۆ ئاخاوتن و پڕکردنی سییەکان بەو هەوایەی کە لەکاتی هەناسەداندا دەردەچێت و لەگەڵیدا کردەی ئاخاوتن دەست پێ دەکات. |
| initial contrast | تقابل استهلالي | **بەرامبەری سەرەتایی:** دوو فۆنیم بەرامبەر بەیەك بوەستن لەسەرەتای دوو وشەی لێکچوو تەنیا لەشوێنی بەرامبەر بەیەك نەبێت جیاوازن لەگەڵ جیاوازی دوو وشەکە لەواتادا، وەکو: شان: ژان. |
| initial mutation | تحول استهلالي | **گۆڕانی سەرەتایی:** گۆڕانی دەنگی کۆنسنەنت لەسەرەتای وشەدا بەهۆی کارتێکردنی دەنگێکی کۆتایی ئەو وشەیەی کە دەکەوێتە پێش وشەکەوە، ئەم جۆرە گۆڕانەش بەزیادکردنی سیفەتی هائیەت یان لووتی یان درێژکردنەوە دەبێت |

| | | |
|---|---|---|
| | | بۆ دەنگە گۆڕاوەکە. |
| initial position | موقع استهلالي | **شوێنی سەرەتایی:**<br>بریتیە لەشوێنی دەنگێك یان پیتێك یان بڕگەیەك لەسەرەتای وشەدا. |
| initial sound | صوت استهلالي | **دەنگی سەرەتایی:**<br>ئەو دەنگەی کە دەکەوێتە سەرەتای وشەوە. |
| initial stress | نبرة استهلالية | **هێزی سەرەتایی:**<br>ئەو هێزە سەرەکییەی کە دەکەوێتە سەر بڕگەی یەکەمی وشەوە. |
| inner closure | اغلاق داخلي | **داخستنی ناوەوە:**<br>داخستنی ڕێڕەوی هەناسە دوور بێت لەهەردوو لێو، واتە ئەو داخستنەی کە لەناو زار یان لە گەروو یان لە قوڕگدا ڕوو دەدات. |
| inspiration | شهيق | **هەناسە وەرگرتن:**<br>بڕوانە زاراوەی (inhalation). |
| instrumental phonetics | علم الاصوات الآلي (التجريبي) | **فۆنەتیکی ئامێری (تاقیکردنەوە):**<br>بڕوانە experimental phonetics هەروەها بە laboratory phonetics ناودەبرێت. |
| intensity | شدة | **توندی (هێز):**<br>بریتیە لەپلەی توندی گۆکردنی بڕگەیەك لەوشەیەکدا. |
| intensity of aspiration | شدة الهائية (النفسية) | **توندی هائیەت (هەناسەیی):**<br>پلەیەکی توندییە دەدرێتە هەناسە لەگەڵ درکاندنی دەنگی گیری کپی هائیدا، بڕوانە (aspirated). |
| inter consonantal | بين صامتين | **نێوان دوو کۆنسنەنت:**<br>سیفەتی ئەو دەنگەیە (ئاسایی دەنگەکە |

| | | |
|---|---|---|
| | | ڤاوڵــــه) کــــه دەکەوێتـــــه نێـــوان دوو کۆنســــنەنتەوە لــــه بڕگەیەکـــدا وەکـــو /ۆ/ لەوشەی (بۆر)دا. |
| intercostals muscles | عضلات بيضلعية | **ماسولکەکانی نێوان پەراسوو:**<br>ئــــەو ماســــولکانەی دەکەونــــه نێــــوان پەراسۆکانی سنگەوە کە حوکم دەکەنە سەر قەبارەی بۆشایی سنگ، سنگش بەدەوری خۆی حوکم دەکاتە سەر قەبارەی سییەکان و ماوەی هەناسە وەرگرتن و هەناسەدان کە وەك کارێکی پێویست لەڕێکخستن و درێژە پێدانی ئاخاوتندا بەشداری دەکەن. |
| interdental | بيأسناني | **نێو ددانی ( دەنگ ):**<br>أ-ئەو دەنگەیە کە نووکی زمان بەسووکی بەر دانەکانی پێشەوە -سەروو خواروو- دەکــەوێت وەکـــو /ذ/ لەوشـــەی (then)ی ئینگلیزیدا، /ذ/ لەزمانی کوردی شێوە زاری هەورامیدا ئاسایی بەکاردێت.<br>ب-سیفەتە بۆ ئەو جۆرە دەنگە. |
| interdental fricative | احتكاكي بيأسناني | **خشۆکی نێو ددانی:**<br>دەنگێـك کەشـێوەی (چـۆنیەتی) درکانـدنی خشـۆکی بێـت و سازگەکەشـی نێـو ددانـی بێت، وەکو /ذ/ و /ظ/ی زمانی عەرەبی. وەك لە وشەکانی (ذکر)و (ظالم)دا گۆدەکرێت. |
| interlude | صامت بيصائتي | **کۆنسنەنتی نێوان دوو ڤاوڵ:**<br>ئەو کۆنسنەنتەی کە دەکەوێتە نێوان دوو ڤاوڵەوە، وەکو /ر/ لەوشەی (باران)دا. |

| | | |
|---|---|---|
| intermediate stress | نبرة ثانوية | **هێزی ناسەرەکی (دووەم):**<br>بڕوانە secondary stress. |
| internal hiatus | وقفة بيصائتية | **وەستانی نێوان دوو ڤاوڵ:**<br>ئەو وەستانەی کە لەنێوان دوو ڤاوڵی دوا بەدوای یەکی وشەیەکدا ڕوو دەدات. |
| internal juncture | فاصل داخلي | **هەڵوەستەی ناوەوە:**<br>فۆنیمێکی ناکەرتییە هێماکەی بەم جۆرەیە /+/ لەنێوان هێزی سەرەکی / ´ / و هێزی سێیەم / ` / دەردەکەوێت. دەکەوێتە ناو وتەکەوە، نەك کۆتایی وتەکە، وەك هەڵوەستەی نێوان هەردوو بەشی (گەنمە شامی) ئەم جۆرە هەڵوەستەیەش کاریگەری بەسەر دەنگەکانی پاش و پێش خۆی دەبێت. |
| internal sandhi | تغير صوتي داخلي | **گۆڕانی دەنگی ناوەوە:**<br>ئەو گۆڕانە دەنگییەی کە لەناوەوەی مۆرفیم ڕوودەدات. |
| internal speech = endo phasia | كلام داخلي | **ئاخاوتنی ناوەوە:**<br>ئەو ئاخاوتنەی کە نابیسترێو شەپۆلەکانی دەنگی تێدا دروست نابێت، وەك خوێندنەوەی بێ دەنگ (لەبەر خۆوە) هەروەها بەزمانی ناوەوە ناو دەبرێت. |
| intervocalic | بيصائتي | **نێوان دوو ڤاوڵ:**<br>سیفەتە بۆ ئەو دەنگەی کە دەکەوێتە نێوان دوو ڤاوڵەوە وەکو /ت/ لەوشەی (هەتاو)دا. |
| intonation | تنغيم | **ئاوازە:**<br>ئەو وتەیەی کە ئاوازەی لەبارو هەڵوەستەی |

| | | |
|---|---|---|
| | | (junctures) گونجاوی دەدرێتێ. ئاوازەش بریتیە لە بەرزکردنەوەو نزم کردنەوەی پلەی دەنگ لەسەرەتا یان پێش کۆتایی یان کۆتایی وتەدا. |
| intonation contour | خط التنغيم | **هێڵی ئاوازەیی:**<br>ئەو جۆرە ئاوازەیەی کە پێك دێت لەئاوازەی سەرەتای وتەو ئاوازەی پێش کۆتایی و کۆتایی کە هەڵوەستەیەکی کۆتایی بەرەو ژوور یان بەرەو خواری لەگەڵدایە، وەکو /↙ 231/ کە ئەم ئاوازەیە (ئازاد لێرەیە) نیشان دەدات یان وەکو /↗ 233/ کە ئەم ئاوازەیە (ئازاد لێرەیە؟) نیشان دەدات. |
| intonation formant | مورفيم التغنيم | **مۆرفیمی ئاوازەیی:**<br>مۆرفیمێکە پێك دێت لەچەند ئاوازەیەك و هەڵوەستەی کۆتایی، وەکو /↓ 231/، ئەمەش بەمۆرفیم دادەنرێت، چونکە گوزارشت لەواتای ڕاگەیاندن یان پرس دەکات، هەروەها لەچەند فۆنیمێکی ناکەرتی پێك دێت. بڕوانە زاراوەی پێشوو. |
| intonation language | لغة تنغيمية | **زمانی ئاوازەدار:**<br>ئەو زمانەی کە ئاوازە بەکاردێنێ وەك بەشێك لەڕستە، نەك وەکو بەشێك لەوشەدا، وەکو زمانی کوردی‌و ئینگلیزی. |
| Intonation-less speech | كلام غير تنغيمي | **ئاخاوتنی بێ ئاوازە** |
| intonation morpheme | مورفيم التنغيم | **مۆرفیمی ئاوازەیی:**<br>بڕوانە (intonation formant). |

| | | |
|---|---|---|
| intonation pattern | نمط التنغيم | **جۆری ئاوازە:**<br>بڕوانە intonation contour. |
| intrusion | اقحام | **زیادکردنی دەنگ:**<br>زیادکردنی دەنگێك لەنێوان دوو بڕگە یان دوو وشەدا بەمەبەستی ئاسانی درکاندن لەکاتی ئاخاوتندا، وەك برا + ان > برایان |
| intrusive sound | صوت مقحم | **دەنگی زیادکراو:**<br>بڕوانە زاراوەی پێشوو. |
| inverted sound = retroflex | صوت ارتدادي | **دەنگی هەڵگەڕاوە:**<br>بڕوانە (cacuminal). |
| IPA | الأبجدية الصوتية الدولية<br><br>الجمعية الصوتية الدولية | بۆ دوو مەبەست بەکار دێت:<br>**١- ئەلفوبێی دەنگی جیهانی:**<br>سیستەمێکە بۆ نووسینەوەی دەنگی بەکاردێت و کۆمەڵەی دەنگی جیهانی دای هێناوە کەپێی دەوترێ:<br>International phonetic Alphabet<br>**٢-کۆمەڵەی دەنگی جیهانی:**<br>پێی دەوترێ<br>International phonetic Association |
| isochronism | تماثل زمني | **لێکچوونی کاتی:**<br>واتە یەکسان بوونی کات لەنێوان هێزی سەرەکی و ئەو هێزەی کە لەپاشییەوە دێت، بێ ئەوەی گوێ بدرێتە ژمارەی بڕگە بێ هێزەکانی نێوانیان، ئەمەش بەرامبەر بەلێکچوونی بڕگەیی دەوەستێت. |
| isophone | خط التماثل الصوتي | **هێڵی لێکچوونی دەنگی:**<br>ئەو هێڵەیە کە لەسەر نەخشەی زمانیدا |

| | | |
|---|---|---|
| | | دەكێشــرێ‌و ســنوری ســیمای دەنگێكــی دیاریكراوی تێـدا نیشـان دەدرێـت، یـان ئـەو ناوچانەی كـه لێكچوونی دركانـدنی دەنگـی زمانێكی تێدا نیشان دەدرێت. |
| isosyllabism | تماثل مقطعي | **لێكچوونی بڕگەیی:** ئـەو ماوەیـەی كـه دركانـدنی بڕگەیـەكی تێـدا بەردەوام دەبێت لەگەڵ ماوەی هەر بڕگەیەكی تردا -هێزداربێت یان بێ هێز- یەكسان بن. |
| isotonic line | خط التماثل النغمي | **هێڵی لێكچوونی ئاوازە:** ئـەو هێڵەیـە كـە لەسـەر نەخشـەی زمانیـدا دەكێشـرێ‌و سـنوری سـیمای ئاوازەیـەكی دیـاریكراوی تێـدا نیشـان دەدرێـت، یـان ســنوری ئـەو ناوچــەیە دیــاری دەكـات كەلێكچــوونی بــەكارهێنانی ئــاوازەی تێدایە. |

# - J -

| | | |
|---|---|---|
| junction vowel | صائت الوصل | **ڤاوڵی گەیێنەر:**<br>ئەو ڤاوڵەی کە بۆ ئاسان کردنی درکاندنی دەنگێکی کۆنسنەنت بەکاردێت. |
| juncture | فاصل، وقفه | **هەڵوەستە (وەستان):**<br>فۆنیمێکی ناکەرتییە لەنێوان دوو وشەدا یان وتەیەك و کپییەکدا (سکون) دێت، کە بەهۆی وەستانەوە دەردەبڕێت، هەڵوەستەش یان لەناوەوە دەبێت، واتە لەناو وشەکەدا، یان لەدەرەوە دەبێت، هەروەها کراوە یان داخراو دەبێت (واتە لەناو ڕستەدا)، بەرەو ژوور rising یان بەرەو خوار falling دەبێت، یان کاتی sustained دەبێت، هێماکانی هەڵوەستەش بەم جۆرە نیشان دەدرێن:<br>هەڵوەستەی بەرەو ژوور /↖/<br>هەڵوەستەی بەرەو خوار /↙/<br>هەڵوەستەی کاتی /⟵/<br>هەڵوەستەی موجەب /+/ |
| juxtapositional assimilation | مماثلة تجاورية | **گونجانی دەوروبەر:**<br>گونجانی دەنگێکی زمانی لەگەڵ دەنگێکی تردا بەهۆی دراوسێتی ڕاستەوخۆی هەردوو دەنگەکە، وەکو گۆڕانی /ش/ بە /ژ/ لەوشەی (پـژدەر)دا بۆ ئەوەی لەگەڵ /د/دا بگونجێت کەڕاستەوخۆ دراوسێیەتی. |
| luxtapositional dissimilation | مغايرة تجاورية | **نەگونجانی دەوروبەر (دوورکەوتنەوە):**<br>گۆڕانی دەنگێکی زمانی بەکارتێکردنی دەنگێکی تر کەڕاستەوخۆ دراوسێی دەنگە گۆڕاوەکەیە. بڕوانە dissimilation. |

# - K -

| | | |
|---|---|---|
| kana | الكانا | **کانا:**<br>بریتیە لەسیستەمی نووسینی بڕگەیی زمانی یابانی. |
| katakana | الكتكانا | **کاتەکانە:**<br>سیستەمێکی نووسینی بڕگەیی یابانییە، بەتایبەتی بۆ نووسینی وشەی بێگانە بەکاردێت. |
| kinetic consonant | صامت حركي | **کۆنسنەنتی بزوێنەر:**<br>ئەو کۆنسنەنتەیە کە لەکاتی درکاندنیدا ناکرێ درێژەی پێ بدرێت بەبێ گۆڕانی جۆرەکەی، ئەمەش بەرامبەر بەکۆنسنەنتی بەردەوامی continuant دەوەستێت کە بەبێ گۆڕانی جۆرەکەی دەکرێ درێژەی پێ بدرێت. |
| karsis | ادغام | **یەك بوون ( چوونە ناویەك ):**<br>بریتیە لەگۆڕانی دوو دەنگی بەرەو دوای یەك لەدوو بڕگەدا بەدەنگێکی درێژ واتە بەچوونە ناویەکی هەردوو دەنگەکە دەنگێکی درێژ دروست دەبێت. وەکو گۆڕانی /ی/ و /ە/ بە /ێ/ لەکورسی + ەکە < کورسێکە. |
| kymograph | مرسام الموجات الصوتية | **کیمۆگراف:**<br>ئەو ئامێرەیە کە جوڵەی شەپۆلەکانی دەنگ دەگوازێتەوە بۆ جوڵەی ئەو سەرە مووەی کە |

| | | |
|---|---|---|
| | | بەدەوری خۆی دەجوولێتەوەو وێنەی شەپۆلەکان لەسەر شریتێکی کاغەز دەکێشێت، ئەم ئامێرەش بۆ دیراسەکردنی سیماکانی فیزیکی دەنگەکانی زمان بەکاردێت. |

# - L -

| | | |
|---|---|---|
| labial | شفوي | **لێوی ( دەنگ ):**<br>ا-ئەو دەنگەیە کەلێوی خوارور بەشداری لەدرکاندنی دەکات، وەکو /ف، ڤ، ب، پ، م/.<br>دەنگەکە یان لێوی دەبێت کەهەردوو لێو بەشداری تێدا دەکەن وەکو /ب، پ، م،/، یان لێو ددانی دەبێت کە دانەکانی سەرەوە لەگەڵ لێوی خواروودا بەشداری تێدا دەکەن وەکو /ف، ڤ/.<br>ب-سیفەتە بۆ ئەو جۆرە دەنگە. |
| labial implosive | انفجاري داخلي شفوي | **گیری ناوەوەی لێو:**<br>دەنگێکی ئاخاوتنە لەهەندێ زماندا هەیە لە ماچ کردن دەچێت.<br>بڕوانە زاراوەی implosive. |
| labialization | تشفيه | **بەلێوکراو:**<br>لەکاتی درکاندنی دەنگێکی زمانیدا سیفەتی لێو خڕکردنی بۆ زیاد بکرێت. |
| labialize | يشفه | **بەلێوکردن:**<br>خڕکردنەوەی لێو لەکاتی درکاندنی دەنگێکدا. |
| labialized | مشفه | **بەلێوکراو:**<br>سیفەتە بۆ دەنگێك کەسیمای لێو خڕکردنی بۆ زیاد بکرێت لەکاتی درکاندنیدا. |
| labialized sound | صوت مشفه | **دەنگی بەلێوکراو:**<br>بڕوانە زاراوەی پێشوو. |
| labial sound | صوت شفوي | **دەنگی لێوی:**<br>بڕوانە زاراوەی labial (ا). |

| | | |
|---|---|---|
| labial stop | انفجاري شفوي | **گیری لێوی:** ئەو دەنگە گیرەیە کە هەردوو لێو بەشداری لەدرکاندنی دەکات وەکو /ب/ و /پ/، هەروەها بەدوو لێوی bilabial ناو دەبرێت. |
| labio dental | اسناني شفوي | **لێو ددانی:** أ-ئەو دەنگەیە کەلێوی خواروو لەگەڵ دانەکانی پێشەوە -سەروو- لێك دەکەون یان لێك نزیك دەبنەوە وەکو /ف، ڤ/. ب-سیفەتە بۆ ئەو جۆرە دەنگە. |
| labiodental fricative | احتكاكي اسناني شفوي | **خشۆکی لێو ددانی:** ئەو دەنگەیە کەشێوەی درکاندنی خشۆکییەو لێوی خوارەوەش لەگەڵ دانەکانی پێشەوە -سەروو- لێك دەکەون، وەکو /ف، ڤ/. |
| labio- labial = bilabial | شفتاني | **دوو لێوی:** أ-ئەو دەنگەیە کە هەردوو لێو بەشداری لەدرکاندنی دەکەن. وەکو /م، ب/. ب-سیفەتە بۆ ئەو جۆرە دەنگە. |
| labiovelar | طبقي شفوي | **لێوی مەلاشوویی نەرم:** ئەو دەنگەیە کە لەگەڵ درکاندنیدا هەردوو لێو خڕ دەبێت و پشتەوەی زمانیش بەرەو مەلاشووی نەرم بەرز دەبێتەوە. |
| labiovelar stop | انفجاري طبقي شفوي | **گیری لێوە مەلاشوویی نەرم:** ئەو دەنگە گیرەیە کەدوو داخستنی ڕێڕەوی هەناسەی لەگەڵدایە، داخستنی یەکەم لەمەلاشووی نەرمدا دەبێت، داخستنی دووەمش لەهەردوو لێو دەبێت. |

| | | |
|---|---|---|
| laboratory phonetics | علم الاصوات المعملي (التجريبي) | **فۆنەتیکی کارگەیی (تاقیکردنەوە):**<br>بڕوانە experimental phonetics. |
| lag = progressive assimilation | مماثلة اتباعية | **گونجانی بەرەو پێش:**<br>گۆڕانی دەنگێك بۆ ئەوەی لەگەڵ دەنگێکی پێش خۆی بگونجێت، وەکو گۆڕانی /د/ بە /ڤ/ لەزاری سلێمانیدا لەوشەی حەڤدە > حەڤڤە. |
| laminal = frontal | أمامي | **پێشەوە (دەنگ):**<br>ا-ئەو دەنگەیە کەپێشەوەی زمان بەشداری لەدرکاندنی دەکات وەکو /ژ، ش، ج، چ، ی نیمچە ڤاوڵ/.<br>ب-سیفەتە بۆ ئەو جۆرە دەنگە. |
| lamino-alveolar | لثوي امامي | **پووکی- پێشەوە:**<br>ا-ئەو دەنگەیە کەپێشەوەی زمان لەگەڵ پووکدا لێك دەکەون.<br>ب-سیفەتە بۆ ئەم جۆرە دەنگە. |
| lamino-domal = fronto-palatal | غاري أمامي | **مەلاشوویی- پێشەوە:**<br>ا-ئەو دەنگەیە کەپێشەوەی زمان لەگەڵ مەلاشووی ڕەقدا لێك دەکەون یان لێك نزیك دەبنەوە وەکو /چ/ و /ی/ نیمچە ڤاوڵ<br>ب-سیفەتە بۆ ئەو جۆرە دەنگە. |
| language | لغة | **زمان:**<br>لەبنجدا سیستەمێکی دەنگییە پێك هاتووە لەکۆمەڵە هێمایەکی لەخۆوە، تاکەکانی کۆمەڵگەیەك بەکاری دێن بەمەبەستی ئاڵ و گۆڕکردنی بیروڕاو هەست و نەستی خۆیان. |

| | | |
|---|---|---|
| language laboratory | مختبر اللغة | **تاقیگەی زمان:**<br>ئەو شوێنەیە کەئامێری تۆمارکردن و شریت و وێنەو نموونەکانی دەنگی زمانێکی تێدایە، بۆ فێرکردنی زمانە بیانیەکان بەکاردێت، هەر قوتابییەکیش شوێنی دانیشتن و ئامێری تایبەتی خۆی هەیە بۆ ئەوەی بتوانێ بەخێرایی فێربێت بەسەرپەرشتی مامۆستای زمان. |
| language systems | انظمة اللغة | **سیستەمەکانی زمان:**<br>ئەو سیستەمانەی زمانی لێ پێك دێت کە بریتیە لەسیستەمی فۆنیمی و سیستەمی دەنگی و سیستەمی مۆرفۆلۆجی سیستەمی سینتاکسی و سیستەمی واتایی. |
| laryngeal = glottal | حنجري | **قورگی (دەنگ):**<br>ا-ئەو دەنگەی کە لەگەروودا دروست دەبێت، وەکو /ئ/ هەمزە، /ھ/.<br>ب-سیفەتە بۆ ئەو جۆرە دەنگە. |
| laryngealized voice | صوت صريري | **دەنگی جیرەیی:**<br>بڕوانە creaky voice. |
| laryngoscope | منظار الحنجرة | **دووربینی قورگ** |
| larynx | حنجرة | **قورگ:**<br>ئەندامێکی کرکراکەییە دەکەوێتە سەرووی بۆری هەناسەوە ژێیەکانی دەنگی تێدایە، کە دەرچەی زوڕنا glottis لێکیان جیادەکاتەوە. هەروەها قورگ. بەسەندوقی دەنگ voice box یان بەسێوی ئادەم Adam's apple ناو دەبرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| latent shwa | شيوة كامنه | **شێوەی شاراوە:**<br>ڤاوێی /a/ کە دەرناکەوێت لەکاتی درکاندنی وشەیەکدا. |
| lateral | جانبي | **لایی (دەنگ):**<br>ا–دەنگێکی زرینگەدارە لەکاتی درکاندنیدا تەزووی هەناسە بەهەر دوولای بۆشایی زارەوە تێ دەبرێت، وەکو /ل، ڵ/.<br>ب–سیفەتە بۆ ئەو جۆرە دەنگە. |
| lateral consonant | صامت جانبي | **کۆنسنەنتی لایی:**<br>بڕوانە زاراوەی lateral. |
| lateral plosion | انفجاري جانبي | **گیری لایی:**<br>بەرەڵابوونی تەزووی هەناسە پاش گیربوونی لەهەردوو لای زارەوە لەکاتی درکاندنی دەنگێکی زمانیدا. |
| lateral release | انطلاق جانبي | **دەرپەڕینی لایی:**<br>بەرەڵابوونی تەزووی هەناسە لەلایەکی زارەوە یان لەهەردوو لاوە. لەکاتی درکاندنی دەنگێکی زمانیدا. |
| lateral resonant | رنيني جانبي | **زرینگاوی لایی:**<br>بڕوانە زاراوەی lateral. |
| lateral spirant | إنسيابي جانبي | **داخزانی لایی:**<br>ئەو دەنگەیە کەتەزووی هەناسەی لەگەڵدا دادەخزێ و لەهەردوو لایی زارەوە دێتە دەرەوە، وەکو /ل، ڵ/. |
| latin alphabet | الأبجدية اللاتينية | **ئەلفوبێی لاتینی** |

| | | |
|---|---|---|
| latinization | تلتين | **بەلاتینی کردن:**<br>گـۆڕینی پیتـــەکانی زمانێـــك بەپیتـــەکانی لاتینی. |
| latinize | يلتين | **گۆڕینی بەلاتینی:**<br>ا-گـۆڕینی ئـەلفوبێی زمانێـك بەئـەلفوبێی لاتینی.<br>ب-شـێوەی نووسـینی لاتینـی بەوشـەیەك بدرێت. |
| lax | لين | **نەرم:**<br>سیفەتە بۆ ئەو ڤاوڵەی کە لەکاتی درکاندنیدا ماسـوولکەکانی زمـان لەگەڵیـدا زۆر گـرژ نابێتـەوە، وەکو /ی/ و /ە/، ئەمـەش بەرامبـەر بەگرژەوە بوو tense دەوەستێت، وەکو /iy/. |
| lax vowel | صائت لين | **ڤاوڵی نەرم:**<br>بڕوانە زاراوەی پێشوو (lax). |
| lene | رخو | **خاو:**<br>سـیفەتە بـۆ ئـەو دەنگـەی کـە لـەکاتی درکاندنیـدا گژبوونـەوەی تونـد لەئەنـدامانی درکاندن ڕوونادات، بڕوانە زاراوەی (lenis). |
| length | طول الصوت | **درێژایی دەنگ:**<br>ئـەو کاتـەی (ماوەیـەی) کەپێویسـتە بـۆ درکانـدنی دەنگێکـی ناخـاوتن، ئەمـەش بەسـیمایەکی گـرنگ دادەنرێـت لەهەنـدێ زمانـدا چـونکە کـە دەنگەکـە درێـژەی پـێ دەدرێت واتای وشـەکە دەگۆڕێ، کەواتە ئەم درێـژە پێدانـە سـیفەتی فۆنیمی وەردەگرێ، بـەڵام لەهەنـدێ زمانـدا ئـەم سـیمایە گرنگـی |

| | | |
|---|---|---|
| | | نـامێنێ، چـونکە درێـژە پێـدانی دەنگەکـە نابێتـە هـۆی گـۆڕینی واتـای وشـە، کەواتـە لێـرەدا درێـژە پێـدان سـیفەتی فـۆنیمی وەرناگرێت. |
| lengthening | إطالة الصوت | **درێژە پێدانی دەنگ:** |
| lenis = lene | رخو | **خاو:**<br>سـیفەتە بـۆ ئـەو کۆنسـنەنتەی کـە گرژبوونەوەیـەکی زۆری ماسـوولکەیی لەگەڵدانییـە، سـیفەتی خـاوی بـەزۆری کۆنسـنەنتە گڕەکـان دەگرێتـەوە، ئەمـەش بەرامبـەر بەتونـد fortis دەوەسـتێ لێـرەدا تێبینی ئەوە دەکرێت کە نـەرم lax و گـرژەوە بـوو tense تـەنیا وەسـفی ڤاوڵـەکانی پـێ دەکرێـت، بـەڵام خـاو و تونـد وەسـفی کۆنسنەنتەکانی پێ دەکرێت. |
| lenis sound | صوت رخو | **دەنگی خاو:**<br>بڕوانە زاراوەی پێشوو کەدەنگی توند fortis sound بەرامبەری دەوەستێ. |
| lenition | ارتخاء | **خاوبوونەوە :**<br>واتـە گـرژ نـەبوونی ماسـوولکەکان لـەکاتی درکانـدنی دەنگێکـدا. کەدەبێتـە هـۆی گواستنەوەی دەنگی توند بۆ دەنگێکی خاو. |
| letter | حرف | **پیت:**<br>هێمایەکی نووسینە کە گوزارشت لـەفۆنیمێك دەکـات، بـەڵام هەنـدێ پیـت لەهەنـدێ زمانـدا گوزارشت لـەفۆنیمێك زیـاتر دەکـات وەکـو /t/ کـە گوزارشـت لـە /t/ و /š/ دەکـات لەوشـەی |

| | | |
|---|---|---|
| | | .(translation) |
| level | مستوى | **ئاست:**<br>١-ئاستی کەرەسەکانی زمان دەگرێتەوە بەوەی کە کەرەسەیەکی دەنگییە یان مۆرفۆلۆجییە یان سینتاکسییە یان واتاییە.<br>٢-ئەو ئاستەی کە زمانی تێدا بەکاردێت، کە ئاستێکی ڕەسمییە یان نارەسمییە یان ئەدەبییە.. . هتد. |
| level intonation | تنغيم مستو | **ئاوازەی ڕێك (یەك ئاست):**<br>ئەو ئاوازەی کە لەسەر یەك ئاست دەڕوات و بەرزو نزم نابێت، ئەمەش بەئاوازەیەکی ئاسایی /2/ دادەنرێت. |
| level juncture | فاصل مؤقت (مستو) | **هەڵوەستەی کاتی (ڕێك):**<br>بڕوانە sustained juncture. |
| liaison | وصل | **گەیەنەر:**<br>درکاندنی ئەو کۆنسنەنتەی کە نادرکێت لەکۆتایی وشەدا کاتی کە وشەیەکی لەپاشەوە بێت و بەڤاوڵ دەست پێ بکات، هەر دوو وشەکەش وەك یەکەیەکی یەکگرتوو بدرکێت.<br>دەست+ ە+ سر > دەستەسر (دەسەسڕ). |
| ligature | حرف مزدوج | **جووتە پیت (دوو پیتی):**<br>دوو پیتی یەکگرتوو لەنوسیندا یان لەچاپدا کە یەك هێما پێك دێنن وەکو / Œ/ لەئینگلیزیدا. |
| light L | لام مخففه | **لامی سووك:**<br>دەنگێکی لامی پووکییە، وەکو (لاو)، کە |

| | | |
|---|---|---|
| | | لامـی قەڵـەو darkl بەرامبـەری دەوەسـتێ وەکو (گوڵ). |
| light syllable | مقطع خفيف | **بڕگەی سووك:** ئـەو بڕگەیـەی کـە هێـزی سـێیەم یـان لاواز وەردەگرێت. |
| light vowel | صائت خفيف | **ڤاوڵی سووك:** ئـەو ڤاوڵەیـە کـەهێزی لەسـەر نییـە، واتـە هێـزدار نییـە. هـەروەها شـێوەی درکانـدنی ڕوون نییە. |
| linear phoneme | فونيم قطعي | **فۆنیمی کەرتی:** بڕوانە Segmental phoneme. |
| linear writing | كتابة خطية | **نووسینی خەتی:** هـەر نووسـینێك هێماکـانی لەسـەر شـێوەی وێنەی شت و مەك بەکار نەهێنێت. |
| linguagram | رسم اللسان | **وێنەی زمان:** ئــەو وێنەیــەی کــە بەشــەکانی زمــان یــان بارودۆخی زمان لەکاتی درکاندنی دەنگێکدا نیشان دەدات. |
| lingual | لساني<br><br><br><br><br>لغوي | **١-زمانی (دەنگ):**<br>أ-ئـــەو دەنگـــەی کـــە زمـــان بەشـــداری لەدرکاندنی دەکات وەکو /ت، د، ل/<br>ب-سیفەتە بۆ ئەو جۆرە دەنگە.<br>ج-سیفەتە بۆ خودی زمان خۆی.<br>**٢-زمانی:**<br>سیفەتە بۆ زمان وەك زاراوە. |
| lingual sound | صوت لساني | **دەنگی زمانی:** بڕوانە زاراوەی پێشوو (أ). |

| | | |
|---|---|---|
| linguistic sound | صوت لغوي | **دەنگی زمانی:**<br>ئەو دەنگەی کە لەگەڵ هاوشێوەکانی خۆیدا وشەو ڕستەکانی زمان پێک دێنن و لەئاخاوتندا بەکاردێن. ئەمەش جیاوازی لەگەڵ دەنگی نازمانیدا هەیە کە بەهۆی لەرینەوەی هەر شتێك شەپۆلەکانی دەنگ دروست دەبن. |
| linguo-dental | اسناني لساني | **زمانی- ددانی:**<br>أ-ئەو دەنگەیە کە نووکی زمان لەگەڵ دانەکاندا لەدیوی ناوەوە لێك دەکەون وەکو /ت/ و /د/.<br>ب-سیفەتە بۆ ئەو جۆرە دەنگە. |
| linking r | الراء الوصيلة | **(ر)ی گەیەنەر:**<br>/ر/ کە لەنێوان دوو ڤاوڵدا بەکاردێت لەدوو برگە یان دوو وشەدا. وەکو وشەی (کەرە). |
| lip rounding | تدوير الشفتين | **خڕکردنی لێومکان:**<br>لەکاتی درکاندنی هەندێ ڤاوڵدا هەر دوو لێو لەشێوەی بازنەدا خڕدەبن وەکو /وو، ۆ، و/ کە بەڤاوڵەکانی پشتەوە ناودەبرێن. |
| lip spreading = unrounding | عدم تدوير الشفتين | **خڕنەبوونی لێومکان:**<br>لێك جیابوونەوەی هەردوو لێو لەکاتی درکاندنی هەندێ ڤاوڵدا وەکو ڤاوڵەکانی /ی، ێ، ɨ/ی پێشەوە هەروەها ڤاوڵەکانی /ە، ا/ی ناوەند. |
| liquid | صامت سلس | **کۆنسنەنتی ڕەوان:**<br>کۆنسنەنتێکی درێژەپێدراوە، کە ڕێڕەوی هەوا لەگەڵیدا فراوان دەبێت بەقەد فراوان |

| | | |
|---|---|---|
| | | بوونی دركاندنی ڤاوڵەكان هەروەها جوڵەی هـەوا لـەكاتی دەرچـوونیدا تاڕادەیـەك نابیستریّ، ئەو دەنگەش یان زارییە وەكو /ر/ و /ل/ یان لووتییە وەكو /م/ و /ن/. |
| lisping | لثغة | **فسە زمانی:**<br>واتە دركاندنی /س/ وەكو /ث/ یان دركاندنی /ز/ وەكـو /ظ/ بـە ئەنقەسـت بێـت یـان بەمەبەستی لاسای كردنەوە یان بەهۆی كەم و كوڕی ئەندامەكانی ئاخاوتن یـان بـەهۆی هەڵەی دركاندن بێت لای منداڵان. |
| logogram | رمز مفرداتي ( لوغوغراف ) | **هێمای وشەیی ( لۆگۆگراف ):**<br>هێمایـەكی نووسـینە كـە گوزارشـت لەوشـەیەكی تـەواو دەكـات وەكـو & كـە بەواتای (and)ی ئینگلیزی دێت. |
| logograph | رمز مفرداتي | **هێمای وشەیی:**<br>بڕوانە زاراوەی پێشوو. |
| logography = word writing | كتابة مفرداتية | **نووسینی وشەیی:**<br>ئـەو نووسـینەیە كەتێیـدا هـەر هێمایـەك یـان پیتێك گوزارشت لەوشەیەكی تەواو دەكات. |
| long consonant | صامت طويل | **كۆنسنەنتی درێژ:**<br>ئەو كۆنسنەنتەیە كە ماوەی دركاندنی درێـژ دەبێتـەوە، ئەمـەش بـەزۆری دەنگـە درێـژە پێدراوەكان دەگرێتەوە، كە دەكریّ كورت و درێـژ بكرێنـەوە وەكـو /س، ل، ن، م/، ئـەم دەنگانـە ئـارەزووی درێژبوونـەوەیان تێدایـە كـاتیّ كـە دەكەونـە كۆتـایی ئاخاوتنـەوە، بـۆ نموونــە /ن/ی ســەرەتای وشــەی (نــان) |

| | | |
|---|---|---|
| | | ئــارەزووی كــورت كردنـــەوەی تێدایـــە، لەكاتێكـدا /ن/ی كۆتـایی وشـەكە ئـارەزووی درێژكردنەوەی تێدایە. |
| long vowel | صائت طويل | **ڤاولی درێژ:** ئـەو ڤاوڵەیـە كـە مـاوەی دركانـدنی درێــژ خایەنە، نیشانەی دوو خاڵی لەسـەریەكی بۆ دادەنرێت بەم شێوەیە /i :/، /e :/، /u :/. |
| loose sound = laxsound | صوت لين | **دەنگی نەرم:** ئـــەو دەنگەیـــە كـــە لـــەكاتی دركاندنیـــدا ماســـوولكەكانی زمـــان بەڕادەیـــەكی كـــەم لەگەڵیـــدا گرژدەبنـــەوە وەكـــو /ه/. ئەمـــەش بەرامبەر بەدەنگی گرژەوە بوو tense sound دەوەستێت. |
| loss of accentuation | فقد النبرة | **لەناوچوونی هێز:** وشـــەیەك هێـــزە ســـەركییەكەی لەناوبچـــێت كاتێ كەشوێنی لەڕستەدا بگۆڕێت. |
| loudness of sound | جهارة الصوت | **گڕی دەنگ:** ســـیفەتە بـــۆ ئـــەو دەنگـــەی كـــە فراوانـــی شـەپۆلەكانی دەنـگ یـان جوڵـەی لـەرەكانی دەنگ حوكمی بەسەردا بكەن. |
| low back round vowel | صائت مدور خلفي منخفض | **ڤاولی نزمی پشتەوەی خڕ:** وەكو /ۆ/ لەوشەی (بۆن)دا. |
| low back vowel | صائت خلفي منخفض | **ڤاولی نزمی پشتەوە:** بڕوانە زاراوەی پێشوو. |
| low central unround vowel | صائت غير مدور مركزي منخفض | **ڤاولی نزمی ناوەندی ناخڕ:** وەكو /ە/ لەوشەی (كەو)دا. |

| | | |
|---|---|---|
| low central vowel | صائت مركزي منخفض | **ڤاولی نزمی ناوەند:**<br>وەکو /ە/ لەوشەی (سەر)دا. |
| lower articulator | ناطق سفلي | **درکێنەری خواروو:**<br>ئەندامێکی درکاندنە توانای جولانەوەی هەیە وەکو لێوی خواروو زمان. درکێنەری سەروو apper articulator بەرامبەری دەوەستێ کە بەشداری درکاندن دەکات بێ ئەوەی لەشوێنی خۆی بجوولێتەوە، ئەمەش ئاسایی بەسازگەی درکاندن ناودەبرێت. |
| lower- case letter | حرف صغير | **پیتی بچووك:**<br>ئەو جۆرە پیتەیە کە لەهەموو شوێنێکی نووسینی ئینگلیزیدا بەکاردێت، تەنیا لەسەرەتای ڕستەو ناوی تایبەتدا نەبێت کە بە پیتی گەورە apper- case letter دەنووسرێت. |
| lower jaw | الفك السفلي | **چەناگەی خواروو:**<br>ئەندامێکی درکاندنی چالاکەو لەکاتی ئاخاوتندا دەجوولێتەوە بەپێچەوانەی چەناگەی سەروو کە ناجوولێتەوە. |
| lower lip | الشفة السلفى | **لێوی خواروو:**<br>وەك درکێنەرێك دەجوولێتەوە لەکاتی درکاندنی هەندێ دەنگدا کە لەگەڵ لێوی سەروو یان دانەکانی سەروودا لێك دەکەون وەك /م/ و /ب/ و /ف/ و /ڤ/. ئەمەش بەرامبەر بەلێوی سەروو دەوەستێت کە وەکو سازگەیەکی درکاندن بەشداری لەدرکاندنی چەند دەنگێکی زمانی دەکات. |
| lower teeth | الاسنان السفلى | **دانەکانی خوارەوە:** |

| | | |
|---|---|---|
| | | سازگەیەکی درکاندنە بەشداری لەدرکاندنی چەند دەنگێك دەکات بێ ئەوەی شوێنەکەی بگۆڕێت وەك دانەکانی سەرەوەو لێوی خواروو. |
| low-frequency sound | صوت منخفض الشيوع<br><br>صوت منخفض الردد | وەك زاراوەیەك بۆ دوو مەبەست بەکاردێت:<br>**١-دەنگی کەم باو:**<br>هەر دەنگێکی زمانی کە بەکارهێنانی لەوشەکانی زمانێکدا زۆر باو نەبێت.<br>**٢-دەنگێك لەرەلەری کەم بێت:** |
| low front unround vowel | صائت غير مدور امامي منخفض | **ڤاوێلی نزمی پێشەوەی ناخڕ:**<br>وەکو /ە/ لەوشەی (هەرمێ) |
| low front vowel | صائت امامي منخفض | **ڤاوێلی پێشەوەی نزم:**<br>وەکو / æ/ لەوشەی (hat)ی ئینگلیزیدا. |
| low pitch | نغم منخفض | **ئاوازەی نزم:**<br>فۆنیمێکی ناکەرتییە نیشانەکەی بەم جۆرەیە (1)، بەنزمترین پلەی ئاوازە دادەنرێت و دەکەوێتە خوار ئاوازەی ئاساییەوە (2) ئاوازەی نزمیش ئەو ئاوازەیە کەرستەی هەواڵی پێ کۆتایی دێت، لەگەڵ ئەو ڕستە پرسانەی کە بەوشەی پرسەوە دەست پێ دەکەن. |
| low vowel | صائت منخفض | **ڤاوێلی نزم:**<br>ئەو ڤاوێڵەیە کە لەکاتی درکاندنیدا زمان لەناوزاردا نزم دەبێتەوە. |

# - M -

| | | |
|---|---|---|
| macron | علامة المد، علامة الاطالة | **هێمای درێژی:** نیشانەکەی بەم جۆرەیە [-] لەسەر دەنگی قاوڵ دادەنرێت و گوزارشت لەدرێژی ڤاوڵەکە دەکات. |
| manner of articulation | كيفية النطق | **چۆنیەتی درکاندن:** بریتیە لەشێوەی درکاندنی دەنگێکی زمانی، وەکو شێوەی یان چۆنیەتی دروست بوونی دەنگە گیرەکان، یان شێوەی دروست بوونی دەنگە خشۆکەکان یان دەنگە لاییەکان یان دەنگە لووتیەکان یان دەنگی تێکەڵاو. لەڕاستیدا هەر دەنگێکی زمانی شێوەی درکاندن و درکێنەرو سازگەی درکاندنی خۆی هەیە، بۆ نموونە /ف/ شێوەی درکاندنی خشۆکییە لێوی خوارووش درکێنەرەو سازگەی درکاندنیشی دانەکانی سەرەوەیە. |
| manual alphabet | أبجدية يدويه | **ئەلفوبێی دەستی:** ئەو ئەلفوبێیەی کە پەنجەکانی دەستی تێدا بەکاردێت لەگەڵ ئەو شێوە جیاوازانەی کە پەنجەکان دروستی دەکەن و کەڕو لاڵ بەکاری دەهێنن بەمەبەستی لەیەکتر گەیشتن. |
| margin | طرف المقطع | **لێواری بڕگە:** بریتیە لەئەم لاو ئەو لای بڕگە، واتە سەرەتای یان کۆتایی بڕگە. |
| marginal phoneme | فونيم فوقطعي | **فۆنیمی ناکەرتی:** بڕوانە suprasegmental phoneme. |

| | | |
|---|---|---|
| margin of security | هامش الأمن | **لێواری ئەمنی:**<br>ئەو بوارەی کە ئەلۆفۆنەکانی فۆنیمێکی تێدا دەجوولێتەوە بێ ئەوەی بچێتە ناوچەی فۆنیمێکی ترەوە. |
| maximum closure | انغلاق اقصى | **بەرزترین پلەی داخستن:**<br>بەرزترین رادەیە بۆ داخستنی رێرەوی هەناسە. شوێنی ئەم جۆرە داخستنەش سازگەی درکاندن دەستنیشانی دەکات. |
| mechanism of utterance | آلیه النطق | **میکانیزمی درکاندن:**<br>ئەو شێوەیەی کە درکاندنی دەنگێکی زمانی پێ ئەنجام دەدرێت. |
| mediae = voiced stops | انفجاريات مجهورة | **گیرە گڕەکان:**<br>وەکو /گ، د، ب/ کە گیرەکپەکان بەرامبەریان دەوەستێت وەکو /ك، ت، پ/. |
| medial accent | نبرة وسطي | **هێزی ناوەندی:**<br>ئەو هێزەیە کە دەکەوێتە سەر بڕگەی ناوەڕاستی وشەیەکەوە. |
| medial contrast | تقابل وسطي | **بەرامبەری ناوەندی:**<br>دوو فۆنیم بەرامبەر بەیەك بوەستن لەدوو وشەی جیاواز لەواتادا، وەکو /ا/ و /ێ/ لەوشەی (شار) و (شێر) |
| medial position | موقع وسطي | **شوێنی ناوەندی:**<br>شوێنی دەنگێك یان بڕگەیەك کە لەناوەڕاستی وشەدا بێت نەك لەسەرەتای یان کۆتایی وشەکە، ئەمەش جیاوازی لەگەڵ شوێنی سەرەتاو شوێنی کۆتاییدا هەیە. |

| | | |
|---|---|---|
| median | وسطي | **ناوەندی:** ئەو دەنگەیە کە هەناسە لەگەڵیدا بەناوەندی بۆشایی زاردا تێ دەپەڕێت، وەکو /س/ و /ی/ ئەمەش دەنگی خشۆکی ناوەندیو ڤاوڵەکانو نیمچە ڤاوڵەکان دەگرێتەوە، ناوەندی لایی بەرامبەری دەوەستێت کە هەناسە لەم لاو لەو لای زارەوە تێ دەپەڕێت وەکو /ل/. |
| median fricative | احتكاكي وسطي | **خشۆکی ناوەندی:** ئەو دەنگە خشۆکەی کە هەناسە لەناوەندی زارەوە تێ دەپەڕێت نەك لەم لاو لەولای زارەوە، وەکو /س، ز، ف، ڤ، ه/. |
| median oral resonant | رنيني فمي وسطي | **زرینگاوی زاری ناوەندی:** وەکو ڤاوڵەکان و نیمچە ڤاوڵەکان، بڕوانە زاراوەی زرینگاو (resonant). |
| median resonant | رنيني وسطي | **زرینگاوی ناوەندی:** ئەو دەنگەی کە ڕێڕەوی لووتی لەگەڵیدا دادەخرێت و تەزووی هەناسەش بەناوەندی بۆشایی زاردا تێ دەپەڕێت بێ ئەوەی هیچ تەگەرەیەك هەبێت لەناو زاردا ڕێگەی لێ بگرێت، ئەمەش ڤاوڵەکان و نیمچە ڤاوڵەکان دەگرێتەوە، کە زرینگاوی لایی بەرامبەری دەوەستێت وەکو /ل، ڵ/. |
| mediopalatal | غاري وسطي | **مەلاشووی ڕەقی ناوەندی:** ا) ئەو دەنگەیە کە لەکاتی درکاندنیدا ناوەندی مەلاشووی ڕەق دەبێت بەسازگەی درکاندنی دەنگەکە. |

| | | |
|---|---|---|
| | | ب) سیفەتە بۆ ئەو جۆرە دەنگە. |
| medium | وسط ناقل | **ناوەندی گواستنەوە:**<br>ئەو ناوەندەیە کە شەپۆلەکانی دەنگی تێدا دەگوازرێتەوە لەقسەکەرەوە بۆ گوێگر. |
| medium of communication | وسيلة الاتصال | **هۆکاری پەیوەندی کردن:**<br>ئەمەش ئاخاوتن یان نووسینەوە دەگرێتەوە. |
| medium transferability | قابلية التحول | **توانای گواستنەوە:**<br>بریتیە لەتوانای گواستنەوەی ئاخاوتن بۆ نووسین، هەروەها توانای گواستنەوەی نووسین بۆ ئاخاوتن. |
| mellow | رقيق | **نەرم (تەنك):**<br>سیفەتە بۆ دەنگی نەرم کە شەپۆلەکانی رێك و پێکن، وەکو دەنگە لێوییەکان، ئەمەش بەرامبەر بەسیفەتی زبر strident دەوەستێت. |
| melodics | نظام التنغيم<br>دراسة التنغيم | **سیستەمی ئاوازە**<br>**دیراسەکردنی ئاوازە** |
| melody | لحن، ايقاع<br>اتساق الاصوات | **ئاواز، تریە (رتم)**<br>**رێك بوونی دەنگەکان** |
| merger | اندماج | **تێکەڵ بوون:**<br>کە سنووری جیاوازی نێوان دوو فۆنیم لەزمانێکدا کەم دەبێتەوە لەئەنجامی گەشەو پەرەسەندنی زمانەکە بەپێی قۆناغەکانی تێپەربوونی کات. هەردوو فۆنیمەکە بە فۆنیمێك نیشان دەدرێن وەکو /خ/ و /غ/ لەزمانی کوردیدا، بۆ نموونە خەم و غەم، ولاخ و ولاغ. |

| | | |
|---|---|---|
| metaphone | صوت متحول | **دەنگی گوڕاو:**<br>ئەو دەنگەیە کەدەکرێ بەدوو شێوەی جیاواز لەوشەیەکدا بدرکێت. |
| metaphony | تحويل الصوت | **گۆڕانی دەنگ:**<br>بڕوانە زاراوەی پێشوو. |
| metathesis | تبادل خاطيء | **ئاڵوگۆڕکردنی بەهەڵە:**<br>١-ئاڵوگۆڕکردنی دەنگێك لەگەڵ دەنگێکی تردا بەهەڵە لەهەمان وشەدا وەکو ئەوەی کەمندالّ بە (مەکتەب) دەڵێت (مەتکەب).<br>٢-ئاڵوگۆڕکردنی وشەیەك بەوشەیەکی تر بەهەڵە لەهەمان ڕستەدا.. |
| mid back round vowel | صائت مدور خلفي وسطي | **ڤاوڵی پشتەوەی ناوەڕاستی خڕ:**<br>وەکو /ۆ/ لەوشەی (بۆر)دا. |
| mid back vowel | صائت خلفي وسطي | **ڤاوڵی پشتەوەی ناوەڕاست:**<br>وەکو /ۆ/ لەوشەی (دۆ)دا. |
| mid central unround vowel | صائت غير مدور مركزي وسطي | **ڤاوڵی ناوەندی ناوەڕاستی ناخڕ:**<br>/ه/ لەوشەی (دە) دا. |
| mid central vowel | صائت مركزي وسطي | **ڤاوڵی ناوەندی ناوەڕاست:**<br>بڕوانە بابەتی پێشوو. |
| middle vowel | صائت وسطي | **ڤاوڵی ناوەڕاست:**<br>هەروەها بەڤاوڵی بێ لایەن neutral vowel ناودەبرێت. |
| midfront vowel | صائت امامي وسطي | **ڤاوڵی پێشەوەی ناوەڕاست**<br>وەکو /ێ/ لەوشەی (شێر)دا. |
| mid pitch | نغم متوسط | **ئاوازەی ناوەندی:**<br>فۆنیمێکی ناکەرتییە نیشانەکەی بەم جۆرەیە |

| | | |
|---|---|---|
| | | /2/ لەهەموو ئاوازەکانی تر باوترە. |
| mid vowel | صائت وسطي | **ڤاوڵی ناوەڕاست:**<br>ئەو ڤاوڵەیە کە لەکاتی درکاندنیدا زمان لەناوەڕاستی بۆشایی زاردا دەبێت، واتە لەبارێکی ناوەندی نێوان بەرزو نزمدا دەبێت، وەکو /ێ/ و /ۆ/، ئەمەش جیاوازی لەگەڵ ڤاوڵی بەرزو ڤاوڵی نزمدا هەیە، هەروەها جیاوازی لەگەڵ ڤاوڵی ناوەندیدا central vowel هەیە. |
| minimal contrast | التقابل الأصغر | **جووتۆکەی بەرامبەر:**<br>دوو فۆنیم لەدوو وشەی جیاواز لەواتادا کە لەدوو شوێنی وەك یەك بەرامبەر بەیەك بوەستن. وەکو /ش، ژ/ کە لەوشەکانی (شان: ژان)دا بەرامبەر بەیەك دەوەستن. ئەم جۆرە بەرامبەرییە بۆ دۆزینەوەو سەلماندنی فۆنیمیەتی.دەنگەکانی هەر زمانێك بەکاردێت. ئەو دوو وشەیەش کەبەرامبەر بەیەك دەوەستن بەجووتە وشە minimal pair ناودەبرێن. |
| minimal pair | ثنائية صفرى | **جووتە وشە :**<br>بڕوانە زاراوەی پێشوو. |
| misspelling | خطأ في التهجئة | **هەڵەی حینجەکردن** |
| modulation | تغير طبقة الصوت | **گۆڕانی جۆری ( چینی ) دەنگ:**<br>ئەو شێوەیەی کەدەنگ وەری دەگرێت و گوزارشت لەوە دەکات کە قسەکەر تا چ رادەیەك قسەکانی کاری تێدەکات، ئەمەش |

| | | |
|---|---|---|
| | | بەمەبەستی ئەوە بەکاردێت کەهەستی گوێگر رابکێشێت یان بۆ ئەوەی باوەڕ (قەناعەت) بەقسەکانی بهێنێت. |
| mono lateral consonant | صامت احادي الجانب | **کۆنسنەنتی یەك لایی:** ئەو کۆنسنەنتەیە کە لەکاتی درکاندنیدا تەزووی هەناسە بەیەك لای زارەوە تێدەپەڕێت وەکو /ل/ی سووك لەوشەی (لێو)دا، کۆنسنەنتی دوولایش بەرامبەری دەوەستێت وەکو /ڵ/ی قەڵەو لەوشەی (گوڵ)دا. |
| monophone | صوت واحد | **یەك دەنگ** |
| mono phonemic | احادي الفونيم | **یەك فۆنیمی:** سیفەتە بۆ ئەو وشەیەی یان برگەیەی کە لەیەك فۆنیم پێك هاتووە وەکو وشەی /a/ لەزمانی ئینگلیزیدا. |
| mono phonic | احادي الصوت | **یەك دەنگی:** سیفەتە بۆ ئەو وشەیە یان برگەیەی کە لەیەك دەنگ پێك هاتووە وەکو برگەی /a/ لەوشەی (ashore) لەزمانی ئینگلیزیدا. |
| mono phthong | صائت احادي (بسيط) | **یەك ڤاوڵی (سادە):** ئەو ڤاوڵەیە کە لەسەرەتای درکاندنیەوە تاوەکو کۆتایی جۆرەکەی ناگۆڕێت، هەروەها بەڤاوڵی سادە simple vowel یان ڤاوڵی خاوێن pure vowel ناودەبرێت، وەکو /ۆ، ێ، ی، و، ە/ ئەمەش ڤاوڵی دوولانە diphthong بەرامبەری دەوەستێت. |
| mono phthongiza- | التحول الى | **گۆڕان بۆ یەك ڤاوڵی:** |

| | | |
|---|---|---|
| tion | صائت احادي | گۆڕانی ڤاوڵی دوو لانه بۆ یەك ڤاوڵی بەپێی قۆناغەکانی گەشەو گۆڕانی زمانەکە. |
| mono syllabic | احادية المقطع | **یەك بڕگەیی:**<br>أ) ئەو وشەیەی کە لەبڕگەیەك پێك دێت وەکو (کەو).<br>ب) سیفەتە بۆ ئەو زمانەی کەهەموو وشەکانی لەیەك بڕگە پێك هاتووە.<br>ج) سیفەتە بۆ ئەو وشەیە کە لەیەك بڕگە پێك دێت. |
| mono syllabic language | لغة احادية المقاطع | **زمانی یەك بڕگەیی:**<br>زمانێك کە لەهەموو بارێکدا وشەکانی لەیەك بڕگە پێك هاتبێت وەکو زمانی (چینی). |
| mono syllabic word | كلمة احادية المقطع | **وشەی یەك بڕگەیی:**<br>ئەو وشەیەی کە لەیەك بڕگە پێك دێت، وەکو: تەم، ڕۆژ، شەو. |
| mono syllabism | احادية المقاطع | **یەك بڕگەیی:**<br>زمانێك کەزۆربەی وشەکانی لەبڕگەیەك پێك هاتبێت، وەك ئەوەی لەزمانی چینیدا هەیە. |
| mono syllable | كلمة احادية المقطع | **وشەی یەك بڕگەیی:**<br>ئەو وشەیەی کە لەبڕگەیەك پێك هاتووە، وەکو: کوڕ، با، دار. |
| mono tone | اطراد رتيب<br>نغمة وتيرية<br>رتابة | زاراوەیەکە بۆ چەند مەبەستێك بەکاردێت:<br>**١-دەرکردنی ڕێك و پێك**<br>**٢-ئاوازەی تیرمیی (وەتەری)**<br>**٣-ڕێك و پێك (ڕەوان)** |
| mono tone speech | كلام رتيب | **ئاخاوتنی ڕێك و پێك:**<br>ئەو ئاخاوتنەی کە لەسەر ئاوازەیەکی یەك |

| | | |
|---|---|---|
| | | تیرەیی بڕوات. |
| mono tony | اطراد النغم | **دەرکردنی ئاوازە:**<br>هەر دەنگێك لەسەر وەتیرەیەك بڕوات. |
| mora | المورا | **مۆرا:**<br>بچووکترین یەکەیە بۆ پێوانەی درێژی لەسیستەمی دەنگە ناکەرتییەکاندا، هەروەها لەبڕگەش بچووکترە. |
| morphemic script | كتابة مورفيمية | **نووسینی مۆرفیمی:**<br>ئەو نووسینەیە کە بۆ هەر مۆرفیمێك هێمایەك بەکار دەهێنێت. |
| morphoneme | فونيم صرفي | **مۆرفۆفۆنیم:**<br>ئەو مۆرفیمەی کە لەشێوەی فۆنیمێکدا خۆی نیشان دەدات. |
| morpho-phoneme | فونيم صرفي | **مۆرفۆفۆنیم:**<br>هەندێ جار مۆرفیم بەپێی ژینگەی دەوروبەری لەشێوەی فۆنیمدا دەردەکەوێت و هەمان ئەرکی مۆرفیمەکە دەبینێ، بۆ نموونە {ەکە}ی ناسیاری لەشێوەی ئەلۆمۆرفی (ك) دەردەکەوێت لەوشەی مامۆستا + ك+ ان. |
| Morpho-phonemic | فونيمي صرفي | **مۆرفۆفۆنیمی:**<br>سیفەتە بۆ ئەو مۆرفیمەی کە لەشێوەی فۆنیمدا دەردەکەوێت. |
| morpho-phonemic change | تغير فونيمي صرفي | **گۆڕانی مۆرفۆفۆنیمی:**<br>بریتییە لەگۆڕانی دەنگی ئەلۆمۆرف بەپێی ئەو ژینگە دەنگییەی کە لەدەوروبەریدا هەیە، وەکو گۆڕانی ئەلۆمۆرفەکانی |

| | | |
|---|---|---|
| | | {ه که}ی ناسیاری که بەم شێوانە {کە، ك، ه ك} دەردەکەون. |
| motor phonetics | علم الاصوات النطقي | **فۆنەتیکی درکاندن:**<br>ئەو زانستەیە کە لەچۆنیەتی درکاندنی دەنگەکانی زمان و سازگەی درکاندن و تایبەتییەکانی دەنگ دەکۆڵێتەوە، هەروەها بە articulatory phonetics ناو دەبرێت. |
| mouth roof | سقف الفم | **بنمیچی زار:**<br>بریتیە لەدیواری دیوی ناوەوەی ژووروی زار کە لەپووکی ددان و مەلاشوی ڕەق و مەلاشوی نەرم و زمانۆچکە پێك دێت، ئەم بەشانەش ڕۆڵێکی گرنگ دەبینن لەدرکاندنی دەنگەکانی زماندا. بەپێی ئەو بەشەی کە بەشداری لەدرکاندن دەکات وەك دەنگی پووکی و دەنگی مەلاشویی ڕەق و مەلاشویی نەرم و دەنگی زمانۆچکەیی. |
| multi syllable = polysyllable | كلمة متعددة المقاطع | **وشەی فرە بڕگەیی:**<br>ئەو وشەیەی کە لەسێ بڕگە یان زیاتر پێك هاتبێت. |
| murmur vowel | صائت خفيف ( محايد ) | **ڤاوڵی نزم (بێ لایەن):**<br>بڕوانە زاراوەی neutral vowel. |
| musical sound | صوت موسيقي | **دەنگی مۆسیقی:**<br>ئەو دەنگەیە کە ئاوازێکی خاوێن یان چەند ئاوازێکی گونجاوی تێدایە. شایەنی باسە ڤاوڵەکان لەدەنگی مۆسیقیەوە نزیکن، بەڵام کۆنسەنەنتەکان لەدەنگی نامۆسیقی و نەشازەوە نزیکن. |

| | | |
|---|---|---|
| mutation | إبدال | **گۆڕینەوە:**<br>گۆڕینی دەنگێك بەدەنگێکی تر لەوشەیەکدا یان لەڕستەیەکدا لەئەنجامی کارتێکردنی ئەو ژینگەیەی کە لەدەوروبەری دەنگە گۆڕاوەکەدا هەیە. |
| mutation plural | جمع ابدالي | **کۆی گۆڕاو:**<br>ئەو ئامرازە کۆیەی کە بەگۆڕینی قاوڵی ناوەڕاست لەناوێکی تاکدا دەست دەکەوێت، هەندیٚ وشە لەزمانی ئینگلیزیدا بەم جۆرە کۆدەکرێنەوە وەك: woman دەبێتە women، foot دەبێتە feet، ئەم جۆرە کۆکردنەوەیە لەزمانی کوردیدا نییە. |
| mute | حرف ساكن<br><br>صوت انفجاري | بۆ دوو مەبەست بەکاردێت:<br>**١- پیتی کۆنسنەنت:**<br>ئەو پیتەیە کە دەنووسرێت بەلاّم گۆناکرێت، وەکو K لە وشەی Knightی ئینگلیزیدا.<br>**٢-دەنگی گیر:**<br>لەکۆندا زاراوەی mute بۆ دەنگی گیر بەکار دەهات، بەلاّم ئێستاکە زاراوەی stop یان plosive بەکاردێت. |

- N -

| | | |
|---|---|---|
| narrow diphthong | ثنصائت ضيق | **ڤاولّی دوولانەی تەنگ:**<br>ئـەو ڤاوڵـە دوولانەیەیـە کـەپاش درکانـدنی بەشـــی یەکـــەمی ڤاوڵەکـــە شـــوێنی زمـــان بەڕادەیەکی کەم لەگەڵیدا دەگۆڕێت وەك /iy/ لەوشـەی (نییـە)، ئەمـەش بەرامبـەر بەڤاوڵی دوو لانەی فراوان wide diphthong دەوەستێت. |
| narrow phonetics | علم الاصوات البحت | **فۆنەتیکی تەواو:**<br>ئەو زانستەیە کە لەڕووی مادییەوە دیراسەی دەنگـەکان دەکـات، هـەروەها لەتایبەتیـەتی درکانـــدن و لایـــەنی فیزیکـــی دەنگـــەکان دەکۆڵێتـەوە، زاراوەی pure phonetice بـۆ هەمان مەبەست بەکاردێت. |
| narrow transcription | كتابة تفصيلية | **نووسینی ورد:**<br>ئەو نووسینە دەنگیەیە کەهەموو سیماکانی دەنگـی تێـدا نیشـان دەدرێـت، واتـە تـەنیا نووسینی هێمای فۆنیمی بەخۆیەوە ناگرێت بەڵکو چەند سیمایەکی تری زیاد دەخرێتە سەر هێماکە، وەکو درێژی و کورتی و هـائی و ولووتی و گڕی و کپی. |
| narrow vowel= close vowel | صائت ضيق (مغلق) | **ڤاولّی تەنگ (داخراوە):**<br>ئـەو ڤاوڵەیـە کـە لـەکاتی درکاندنیـدا زمـان بـــەرەو مەلاشـــوو بەرادەیـــەکی زۆر بـــەرز دەبێتـــەوە، هـــەروەها زاریـــش بەڕادەیـــەکی تـەواو لەگەڵیدا دەکرێتـەوە وەکـو ڤـاوڵی /ی/ درێـژو /و/ درێـژ کـە بـەڤاوڵی بـەرز high vowel بەناو بانگن. |

| | | |
|---|---|---|
| nasal | انفي | **لووتی ( دەنگ ):**<br>أ) دەنگێکی زینگەدارە لەدرکاندنیدا پشت بەبۆشایی لووت دەبەستێت کاتێ کە ڕێڕەوی زاری دادەخرێت و تەزووی هەناسەش تەنیا بەڕێڕەوی لووتیدا تێدەپەڕێت. بەشی دواوەوەی مەلاشووش بەهۆی نزم بوونەوەی بۆ خوارەوە بەشداری لەداخستنەکە دەکات، وەکو /ن/ و /م/.<br>ب) سیفەتە بۆ ئەو جۆرە دەنگە. |
| nasal cavity | التجويف الأنفي | **بۆشایی لووت:**<br>ڕێڕەوی لووتی یەکێکە لەبۆشاییەکانی زرینگان، بەشداری لەبەرهەمهێنانی دەنگەکانی زمان دەکات، بۆشاییەکانی تریش بریتین لەبۆشایی زارو بۆشایی گەروو بۆشایی سییەکان. |
| nasal consonant | صامت انفي | **کۆنسنەنتی لووتی:**<br>ئەو دەنگە کۆنسنەنتەیە کە لەکاتی درکاندنیدا تەزووی هەناسە تەنیا بەلووتدا تێ دەپەڕێت و ڕێڕەوی زاریش لەگەڵیدا دادەخرێت، وەکو /م/، /ن/ ، [نگ]. |
| nasalization | تانيف ( انفمية ) | **بەلووت کردن ( لووتە زاری ):**<br>سیفەتە بۆ ئەو دەنگەی کە لەکاتی درکاندنیدا ڕێڕەوی زاریو لووتی بەیەکەوە لەیەك کاتدا بەکراوەیی دەمێننەوە. |
| nasalized consonant | صامت مؤنف | **کۆنسنەنتی بەلووت کراو:**<br>ئەو کۆنسنەنتەیە کە ڕێڕەوی هەناسە لەگەڵیدا بەناو زارو لووتدا تێ دەپەڕێت |

| | | |
|---|---|---|
| | | ئەمەش جیاوازی لەگەڵ کۆنسنەنتی زاریدا هەیە کە تەزووی هەناسە تەنیا بەناو زاردا تێدەپەڕێت، هەروەها جیاوازی لەگەڵ کۆنسنەنتی لووتیدا هەیە، کە تەزووی هەناسە تەنیا بەناو لووتدا تێدەپەڕێت. |
| nasalized sound | صوت مؤنف | **دەنگی بەلووت کراو:**<br>بڕوانە زاراوەی پێشوو. |
| nasal pharynx | البلعوم الآنفي | **گەرووی لووتی:**<br>ئەو بەشەیە لەگەروو کە بە بۆشایی لووتەوە لکاوەو دەکەوێتە نێوان کۆتایی مەلاشوی نەرم و دیواری دواوەوەی گەروو. |
| nasal plosion | انفجار أنفي | **گیری (تەقینی) لووتی:**<br>بریتییە لەدەربازبوونی هەناسە پاش گیربوونی و تێپەڕبوونی بەلووتدا بۆ دروست کردنی دەنگێکی لووتی گیر. |
| nasal plosive | إنفجاري أنفي | **گیری لووتی (دەنگ):**<br>دەنگێکی گیرە، تەزووی هەناسە لەگەڵیدا گیر دەبێت پاشان دەرباز دەبێت و تەنیا بەناو لووتدا تێدەپەڕێت. |
| nasal sound | صوت انفي | **دەنگی لووتی:**<br>ئەو دەنگەیە کە لەکاتی درکاندنیدا ڕێڕەوی زاری دادەخرێت و ڕێڕەوی لووتی لەگەڵیدا دەکرێتەوە، وەکو /م/ و /ن/. |
| nasal vowel | صائت انفمي | **ڤاوڵی لووتە زاری (بە لووت کراو):**<br>ئەو ڤاوڵەیە کە لەکاتی درکاندنیدا هەوا بەناو زارو لووتدا لەیەک کاتدا تێدەپەڕێت، ناونانی دروستی ئەم جۆرە دەنگەش ڤاوڵی |

| | | |
|---|---|---|
| | | بەلووت کراوە (nasalized vowel). |
| neutralization | تحييد | **بێ لایەن:**<br>بریتیە لەنەمانی جیاوازییەکی گرنگی نێوان دوو فۆنیم، کاتێ کە یەکێکیان لەشوێنێکدا دەردەکەوێت، بۆ نموونە: دەرکەوتنی /د/ لەکۆتایی وشەی (مهاباد)دا وەکو /ت/ گۆ دەکرێت، لەبەر ئەوە هەندێ جار جیاوازی نێوان درکاندنی هەردوو فۆنیمی /ت، د/ بەئاسانی دیاری ناکرێت. |
| neutral vowel | صائت محايد | **ڤاولی بێ لایەن:**<br>ئەو ڤاوڵەیە کە لەکاتی درکاندنیدا زمان لەبارێکی بێ لایەن دەبێت، واتە ڤاوڵێکی ناوەندی ناوەڕاستە، وەکو /ە/. |
| nigori mark | علامة الأجهار | **نیشانەی گڕی (ژێداری):**<br>نیشانەکەی بەم جۆرەیە [゛] گوزارشت لەکۆنسنەنتی گڕ دەکات ئەم نیشانەیەش بەتایبەتی لەنووسینی کانای یابانیدا بەکاردێت و گوزارشت لەوە دەکات کە برگەکە بەکۆنسنەنتێکی گڕ دەست پێ دەکات. |
| noise | إعاقة | **تەگەرە:**<br>هەر تەگەرەیەکی دەنگی بێت یان نووسین بێت ببێتە هۆی لادانی یان تێنەگەیشتنی نامەیەکی زمانی، ئەم جۆرە تەگەرەیەش لەئەنجامی چەند هۆکارێکەوە سەرهەڵدەدات، وەکو ئەو ئاخاوتنەی کەبەڕوونی تۆمار نەکراوە یان ئاخاوتنی |

| | | |
|---|---|---|
| | | تەلەفۆنی کەقسەکانی ڕوون نەبێت یان نووسینێکی ناڕێک کە بەخەتێکی خراپ تۆمار کرابێت. |
| non-contiguous assimilation | مماثلة غير متجاورة | **گونجانی نادموروبەر ( دوور ):**<br>بریتیە لەگۆڕانی دەنگێك بۆ ئەوەی لەگەڵ دەنگێکی تردا بگونجێت کەڕاستەوخۆ ناکەونە پاڵ یەکەوە بۆ نموونە /ت/ لەوشەی (تەڕ)دا لەسیمای قەڵەویدا وەکو /ڕ/ی قەڵەوی لێ هاتووە. |
| non-continuant sound | صوت غير امتدادي ( إنفجاري ) | **دەنگی درێژە پێنەدراو ( گیر ):**<br>بڕوانە زاراوەی گیر stop. |
| non-distinctive feature | سمة غير مميزة | **سیمای جیانەکەرەوە:**<br>سیمایەکی دەنگییە نابێتە هۆی دروست بوونی جیاوازی لەواتادا، وەکو سیمای هائیەت و درێژکردنەوەی کۆنسنەنت. |
| non-functional difference | فرق غير وظيفي | **جیاوازی نائەرکی:**<br>ئەو جیاوازییەی کە لەنێوان دوو دەنگدا هەیەو کار لەواتا ناکات، وەکو جیاوازی (پ)ی هائی لەوشەی (پەمەیی) و (پ)ی ناهائی لەکۆتایی وشەی (تۆپ)دا دەردەکەوێت. |
| non-functional variation | تغير غير وظيفي | **گۆڕانی نائەرکی:**<br>ئەو ئەلۆفۆنەی کە لەشوێنی ئەلۆفۆنێکی تر دەردەکەوێت بێ ئەوەی واتای وشەکە بگۆڕێت، ئەم دیاردەیەش بەگۆڕانی ئازاد free variation ناودەبرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| non- lateral sound | صوت غير جانبي | **دەنگی نالایی:** ئـەو دەنگەیـە کـە تـەزووی هەناسـە لەناوەڕاسـتی بۆشـایی زارەوە لەگەڵیـدا دەردەچێت، وەکو /س/. |
| non- nasal | غير انفي | **نالووتی:** سیفەتە بۆ ئەو دەنگەی کە تەزووی هەناسە لە لووتـەوە تـێ ناپـەڕێت بـەڵکو بـەناو زاردا تێدەپەڕێت. |
| non- nasalized | غير مؤنف | **بەلووت نەکراو:** بڕوانە زاراوەی بەلووت کراو nasalized. |
| non- phonemic | غير فونيمي | **نافۆنیمی:** سـیفەتە بـۆ ئـەو سـیما دەنگییـەی کـەبوونی یان نەبوونی کار ناکاتە سەر واتای وشـەوە، هـەروەها بە نائـەرکی non- functional نـاو دەبرێت. |
| non- phonemic difference | فرق غير فونيمي | **جیاوازی نافۆنیمی:** ئـەو جیاوازییـەی کـە لـەنێوان دوو دەنگـدا هەیـەو کـار ناکاتـە سـەر واتـا، وەکـو /ی/ی کورت و درێژ لەزمانی کوردیدا. |
| non- significant feature | سمة غير هامة | **سیمای ناگرنگ (نائەرکی):** سیمایەکی دەنگییە، بوونی یـان نـەبوون کـار لـەواتا ناکـات، بڕوانـە سـیمای جیانەکـەرەوە non- distinctive feature. |
| non- vocalic | غير صائتي | **ناڤاولی:** سیفەتە بۆ ئەوانەی کەڤاوڵ نین. |
| non- vocal signal | اشارة غير صوتية | **هێمای نادەنگی (نازمانی):** وەکو جووڵانەوەو بزوتنەوەی لەش کە لەگەڵ |

| | | |
|---|---|---|
| | | ئاخاوتندا بەکاردێت. |
| non- vocoid | غير صائتي | **ناڤاوڵی:**<br>بڕوانە زاراوەی ڤاوڵ vocoid. |
| normal speech | كلام عادي | **ئاخاوتنی ئاسایی:**<br>ئەو ئاخاوتنەی کەهەموو ڤاوڵەکانی تێدا گڕ دەبن، ئەمەش بەرامبەر بەزاراوەی وەش وەشە whisper دەوەستێت. |
| normative phonetics | علم الاصوات المعياري | **فۆنەتیکی پێوانەیی:**<br>ئەو زانستەیە کە لەدەنگەکانی زمان دەکۆڵێتەوە وەك ئەوەی کە پێویستە بدرکێن، ئەمەش بەرامبەر بەفۆنەتیکی وەسفی دەوەستێت. |
| nucleus of the syllable | نواة المقطع | **ناوکی بڕگە:**<br>ئەو ڤاوڵەی کە هێزی بڕگە وەردەگرێت بەناوکی بڕگە ناو دەبرێت، دەشێ هێزێکی سەرەکی بێت یان هێزێکی لاوەکی یان هێزی سێیەم یان هێزێکی لاواز بێت. ناوکی بڕگەش لەزمانی کوردیدا یەکێك لەو هەشت ڤاوڵە دەبێت کە لەزمانەکەدا هەیە. |

# - O -

| | | |
|---|---|---|
| obstruent | غير رنيني | **نازرینگەدار ( دەنگ ):**<br>واتە دەنگێکی گیر یان خشۆکی یان تێکەڵاو، ئەمـــەش بەرامبـــەر زرینگـــەدار resonant دەوەستێت کەدەنگی لووتیو نیمچە ڤاوڵ و ڤاوڵ دەگرێتەوە. |
| occlusion | انغلاق | **داخستن:**<br>بریتیە لەداخستنی ڕێگەی تەزووی هەناسە کە لەپێش درکاندنی دەنگێکی گیردا ڕوو دەدات. |
| occlusive = plosive | انفجاري | **گیر ( تەقیو ):**<br>بڕوانە دەنگی گیر (وەستاو) stop. |
| oesophageal cavity | التجويف المريئي | **بۆشایی سورێنچك:**<br>بۆشایی ناو گەدەو سورێنچك دەگرێتەوە، ئەمـــەش پەیوەنـــدی بەدرکانـــدنی چـــەند دەنگێکـی زمانییـەوە هەیـە، کـە لەهەنـدێ حاڵەتی نەخۆشیدا ڕوو دەدات. |
| off- glide | استرخاء | **خاوبوون:**<br>پاش قۆناغی درکاندنی دەنگێکی زمانی ڕوو دەدات کە ئەندامانی ئاخاوتن دەچنەوە سەر باری سروشتی خۆیان یان ئامادە دەبن بۆ درکاندنی دەنگێکی تر، ئەمەش بەرامبەر بـــەزاراوەی ئامـــادە بـــوون (on-glide) دەوەستێت. |
| on- glide | تهيؤ | **ئامادەبوون:**<br>بریتیـــە لـــەقۆناغی یەکـــەمی درکانـــدنی دەنگێکی زمانی کاتێ کە ئەندامانی ئاخاوتن |

| | | |
|---|---|---|
| • | | ئامـاده دەبـن بـۆ دركانـدنی دەنگەکـە، هـەر ئەنـدامێکیش شـوێنی پێویسـتی خـۆی وەردەگرێت. |
| onset | تهيؤ | بۆ دوو مەبەست بەکاردێت:<br>**١-ئامادەبوون:**<br>بریتیـە لەجولانـەوەی ئەنـدامانی ئاخـاوتن لەشوێنی ئاسایی خۆیانـەوە بـۆ شـوێنێکی نویێ بەمەبەستی ئامادە بوون بۆ دركانـدنی دەنگێکی زمانی.<br>**٢-بریتیە لەبەشی یەکەمی برگە.** |
| open approximant | امتدادي غير احتكاكي | **بەردەوامی ناخشۆکی:**<br>هـەر دەنگێکی کۆنسنەنتی نـاگیر یـان قـاوڵ یـان نیمچـە قـاوڵ دەگرێتـەوە. هـەروەها بـە frictionless continuant ناودەبرێت. |
| opening degree | درجة الأنفتاح | **پلەی کرانەوە:**<br>بریتیە لەڕادەی کرانەوەی ئەو دوو ئەندامەی کە پێویستە بەکاربێن لەدرکاندنی دەنگێکی زمانیدا. مەبەست لەو دوو ئەندامە درکێنەرو سازگەی درکاندنە، پلەکانیش لەنێوان بەیەك گەیشـتنی تـەواوو کرانـەوەی تـەواوی ئەندامەکانـدا بـەدی دەکرێـت، بەیـەك گەیشتنی تەواوی ئەندامەکان لەدەنگی گیردا ڕوو دەدات، بـەڵام کرانـەوەی تـەواوی ئەندامەکان لەقاوڵەکاندا ڕوو دەدات. |
| open juncture | فاصل مفتوح | **هەڵوەستەی کراوە:**<br>فۆنیمێکی ناکەرتییە نیشانەکەی بەم جۆرەیە /+/ لەنێوان هێزی سەرەکی و هێزی سێیەمدا |

| | | |
|---|---|---|
| | | دەردەکەوێت. |
| open syllable | مقطع مفتوح | **بڕگەی کراوە:**<br>ئـەو بڕگەیەیـــــە، کـە کـــــۆتایی بـەڤاوڵ دێـت هـەروەها پێـی دەوتـرێ بڕگـەی ئـازاد free syllable ئـەم جـۆرە بڕگەیـە لەکوریـدا زۆر بـاوە بەپێچـەوانەی بڕگـەی داخـراوە بەتایبەتی لەشیعردا. |
| open transition | فاصل مفتوح | **هەڵوەستەی کراوە:**<br>بڕوانە زاراوەی open juncture. |
| open vowel | صائت متسع | **ڤاوڵی کراوە:**<br>ئـەو ڤاوڵەیــە کـەزار بەشـێوەیەکی دیـار لەگەڵیدا دەکرێتەوەو ڕێرەوی هەواش فراوان دەبێـت بـەهۆی ئـەوەی کـەزمان لـەناو زاردا ئاسـتێکی نـزم وەردەگرێـت، وەکـو /a/. هـەروەها بـەڤاوڵی نـزم low vowel ناودەبرێـت، کـە بەرامبـەر close vowel دەوەستێت. |
| opposition | تقابل | **بەرامبەر:**<br>هـەر فۆنیمێـك لەزمانێکـدا بەرامبـەر بەهـەر فـۆنیمێکی تـر بوەسـتێت لەهـەمان زمانـدا، هەروەها بە contrast ناودەبرێت. |
| oral | شفوي<br><br><br>فمي | **١-زارەکی:**<br>سـیفەتە بـۆ ئـەوەی کـە نووسـین نییـە. واتـە ئەوەی کە بەزار دەردەبڕێت.<br>**٢-زاری:**<br>ئەوەی کە پەیوەندی بەزارەوە هەیە. |
| oral cavity | التجويف | **بۆشایی زار:** |

| | | |
|---|---|---|
| | الفمي | یەکێکە لەو بۆشاییانەی کە تەزووی هەناسە بەناویدا تێدەپەڕێت و بەشداری لەدروست بوونی دەنگەکانی زمان دەکات. |
| oral consonant | صامت فمي | **کۆنسنەنتی زاری:** ئەو کۆنسنەنتەیە کە لەناو زارەوە دەدرکێت، نەك لە لووت و گەرووەوە وەکو /ت، ف، س/. |
| oral resonant | رنيني فمي | **زاری زرینگاو:** ئەو دەنگەی کە ڕێڕەوی لووتی لەگەڵدا دادەخرێت و ڕێڕەوی زاریش دەکرێتەوە ئەم زاراوەیە هەموو دەنگە ڤاوڵەکان و نیمچە ڤاوڵەکان دەگرێتەوە لەگەڵ فۆنیمی /ل/ بەو سیفەتەی کە دەنگێکی لایی زرینگاوە. |
| oral sound | صوت فمي | **دەنگی زاری:** ئەو دەنگەیە کە ڕێڕەوی لووتی لەگەڵیدا دادەخرێت و ڕێڕەوی زاری دەکرێتەوە ئەمەش یان زاری دەرەوە extra- oral وەکو /ف، ب، م/ یان زاری ناوەوە intra- oral وەکو /ت، د، س/ یان زاری دواوە post- oral وەکو /ك، گ/ دەگرێتەوە. |
| organs of speech | اعضاء الكلام | **ئەندامانی ئاخاوتن:** ئەو ئەندامانەیە کەبەشداری لەپرۆسەی ئاخاوتن دەکەن، بریتین لەمانەی خوارەوە سییەکان، گەروو، سورێنچك، زار، زمان، دانەکان، هەردوو لێو مەلاشووی نەرم، مەلاشوی ڕەق، زمانۆچکە، لووت هەندێ لەم ئەندامانە ئەرکی پاڵ پێوەنانی تەزووی |

| | | |
|---|---|---|
| | | هەناسە دەبینن وەکو سییەکان هەندێکی تریان کار دەکەنە سەر گرو کپی دەنگەکان وەکو ژێکانی قورگ هەندێکی تریان دەجوولێنەوە پێیان دەوترێ درکێنەر وەکو زمان هەندێکی تر بەشداری لەدرکاندن دەکەن بێ ئەوەی بجولێنەوە پێیان دەوترێ سازگەی درکاندن وەکو مەڵاشوو پووکی ددان. |
| orthographic lag | تخلف كتابي | **نووسینی کۆن:**<br>ئەو وشەیەی کە لەرووی دەنگەوە بەتێپەربوونی کات گۆڕانی بەسەردا دێت بێ ئەوەی ئەو گۆڕانە کار لەشێوەی نووسینی وشەکە بکات. |
| oscillogram | رسم الذبذبات | **وێنەی لەرەکان:**<br>ئەو وێنەیەیە کە وێنەگری لەرەکانی دەنگ دەمان داتێ بۆ پێوانەی شەپۆلەکانی دەنگ و لەرە لەرو فراوانی شەپۆل و گڕی دەنگ بەکاردێت. |
| oscillograph | مرسام الذبذبات | **وێنەگری لەرەکان:**<br>ئەو ئامێرەیە کە جیاوازی پاڵەپەستۆی شەپۆلەکانی دەنگ و لەرەلەرو فراوانی شەپۆل و گڕی دەنگی پێ تۆمار دەکرێت. |
| outer-closure | اغلاق خارجي | **داخستنی دەرەوە:**<br>بریتیە لە داخستنی ڕێڕەوی تەزووی هەناسە کە دوورە لە سییەکان و نزیکە لە هەردوو لێو. |
| over-differentiated | كتابة مفرطة | **نووسینی زیاد ڕۆیی بۆ جیاکردنەوە:** |

| | | |
|---|---|---|
| transcription | للتمييز | نووســـينێكی فـــۆنیمی ســـەرەتاییە. لـــەم نووســـینەدا ئەلۆفۆنـــەكان وەكـــو فـــۆنیم تەماشـــادەكرێن و بـــۆ هـــەر ئـــەلۆفۆنێكیش هێمایـەكی سـەربەخۆ دادەنرێـت. ئـەم جـۆرە نووسینەش وەك هـەنگاوێكی سـەرەتایی لـە شیكردنەوەی دەنگەكاندا بەكاردێت، تـاوەكو باری هەر دەنگێك ساغ دەبێت و دەچەسپێت، بـەوەی كـە فـۆنیمێكی سـەربەخۆیە یـان ئەلۆفۆنێكە لە سنووری فۆنیمێكدایە. |
| oxytone | كلمة منبورة الاخر | **هێزبوونی كۆتـایی وشە :** ئـەو وشـەیەی كـە هێـزی سـەرەكی دەكەوێتـە سەر بڕگەی كۆتایی وشەكەوە. |
| oxytonic language | لغة منبورة الاخر | **زمانی هێزبوونی كۆتـایی :** زمانێـك زۆربـەی وشـەكانی هێـزی سـەرەكی بكەوێتە سەر بڕگەی كۆتایی وشەكانیەوە. |

# - P -

| | | |
|---|---|---|
| paleography | دراسة الكتابات القديمة | **ديراسه كردنی نووسراوی كۆن :** بريتيه له ديراسهكردنی ئهو نووسراوه كۆنانهی كه لهسهر ڕووبهرێكی نهرمدا نووسراونهتهوه. |
| palatal | غاري | **مهلاشوويی ڕەق :** ا. ئهو دهنگه كۆنسنهنتهيه كه له كاتی دركاندنيدا زمان له مهلاشووی ڕهق دهكهوێت يان لێی نزيك دهبێتهوه. ب. سيفهته بۆ ئهو جۆره دهنگه. |
| palatal fricative | احتكاكي غاري | **خشۆكی مهلاشوويی ڕەق :** ئهو دهنگهيه كه شێوهی ( چۆنيهتی) دركاندنی خشۆكييهو سازگهی دركاندنيشی مهلاشووی ڕهقه وهكو /ش/. |
| palatalization | تغوير | **بهر مهلاشوودانی ڕەق :** وهك كردهيهك له دركاندنی چهند دهنگێكی زمانيدا ڕوودهدات كاتی كه ناوهندی زمان كهمێك بهرهو مهلاشووی ڕهق بهرز دهبێتهوه، بهم كارهش سيفهتی مهلاشوويی ڕهق بۆ دهنگهكه زياد دهكرێت كه له بنجدا دهنگهكه مهلاشوويی ڕهق نييه. |
| Palatalized = soft | مغور | **بهرمهلاشوو دراوی ڕەق :** سيفهته بۆ ئهو دهنگهی كه له كاتی دركاندنيدا سيمای بهرمهلاشوودانی بۆ زياد دهكرێت، بڕوانه زاراوهی پێشوو. |
| palatalized consonant | صامت مغور | **كونسنهنتی بهرمهلاشوودراوی ڕەق :** بڕوانه زاراوهی بهر مهلاشوودانی ڕهق |

| | | |
|---|---|---|
| | | (palatalization) . |
| palatalized sibilant | صفيري مغور | **فیکەیی بەرمەلاشوودراوی ڕەق:**<br>وەکــو /ش/، /ژ/ ، هــەروەها بــە دەنگــی شیکەیی hushing sound ناودەبرێت. |
| palatalized sound | صوت مغور | **دەنگی بەرمەلاشوودراوی ڕەق:**<br>ئــەو دەنگەیــە کــە لــە کــاتی درکاندنیــدا بەرمەلاشـوودانی ڕەقـی لەگـەڵ دایـە، بڕوانـە بەر مەلاشوودانی ڕەق (palatalization). |
| palatal sound | صوت غاري | **دەنگی مەلاشوویی ڕەق:**<br>ئــەو دەنگەیــە کــە لــە کــاتی درکاندنیــدا مەلاشـووی ڕەق دەبێتـە سـازگەی درکانـدنی دەنگەکــەو زمــانیش وەك درکێنــەر لــە مەلاشــووی ڕەق دەکــەوێت یــان لێــی نزیــك دەبێتەوە، وەکو / ج/ ، /چ/، /ی نیمچە ڤاوڵ/ |
| palatal vowel | صائت غاري ( امامي ) | **ڤاوڵی مەلاشوویی ڕەق ( پێشەوە ):**<br>بڕوانە زاراوەی ڤاوڵی پێشەوەfront vowel. |
| palatal | حنك<br><br>الحنك الصلب | بۆ دوو مەبەست بەکاردێت:<br>١-**مەلاشــوو**: بریتیــە لــە بنمیچــی نــاو زار، بەدرێــژایی ئــەو ناوچــەیە دەگرێتــەوە کــە دەکەوێتــە نێــوان پــووکی دانــی ســەروو زمانۆچــکە، بەشــی پێشــەوەی ڕەقەوبەشــی پشتەوەی نەرمە.<br>٢-**مەلاشــووی ڕەق**، بەشــی پێشــەوەی مەلاشوو دەگرێتەوە، لە پارچە ئێسکێك پێك دێــت و دەکەوێتــە پــاش پــووکی دانــەکانی سەروو، دەبێتـە سـازگەی درکانـدن بـۆ چـەند |

| | | |
|---|---|---|
| | | دەنگێکی زمانی وەك /ج، چ، ش/. |
| palato-alveolar | لثوي غاري | **پووکە مەلاشوویی ڕەق:**<br>١-ئەو دەنگەیە کە لە کاتی درکاندنیدا پێشەوەی زمان لەو ناوچەیە دەکەوێت کە لەنێوان پووکی دانو مەلاشووی ڕەقدایە یان لێی نزیك دەبێتەوە وەك /چ/.<br>٢-سیفەتە بۆ ئەو جۆرە دەنگە |
| palatogram | رسم الحنك | **وێنەی مەلاشوو:**<br>بریتیە لە وێنەی مەلاشوو کە تێیدا خاڵی لێکەوتنی زمان لەگەڵ مەلاشوودا نیشان دەدات لەکاتی درکاندنی دەنگێکدا. |
| palatography | دراسة رسوم الحنك<br><br>تصوير الحنك | **١-دیراسەکردنی وێنەکانی مەلاشوو:**<br>دیراسەی دەنگەکانی زمان دەکات بۆ ئەوەی خاڵی درکاندنی دەنگەکان دیاری بکات بە ڕێگەی وێنەگرتنی مەلاشوو یان بە بەکارهێنانی مەلاشووی دروست کراو.<br>**٢-وێنەگرتنی مەلاشوو:**<br>بریتیە لە وێنەگرتنی مەلاشوو لە کاتی درکاندنی دەنگێکی زمانیدا بۆ ئەوەی شوێنی زمان سەبارەت بە مەلاشوو دیاری بکرێت. |
| paleography | دراسة الكتابة القديمة<br>كتابة قديمة | وەك زاراوەیەك دوو مەبەست دەگەیەنێت:<br>**١-دیراسەکردنی نووسینی کۆن**<br>**٢-نووسینی کۆن.** |
| paradigmatic | تقابل | **بەرامبەری:** |

| | | |
|---|---|---|
| contrast | راسي | ئەوەیە کە فۆنیمێك بتوانێ لە شوێنی فۆنیمێکی تردا دەربکەوێت لە وشەیەکی زۆردا، کە ببێتە هۆی دروست بوونی وشەی نوێ‌و واتای جۆراو جۆر ببەخشن وەکو: شار، دار، پار، مار، هار. . . هتد. ئەمەش سیفەتێکە لە سیفەتەکانی فۆنیم. |
| partial assimilation | مماثلة جزئية | **گونجانی بەشی ( ناتەواو ):**<br>ئەو جۆرە گونجانەیە کە بەشێك یان سیفەتێك لە دەنگەکە دەگۆڕێت، بۆ ئەوەی لەگەڵ دەنگە کارتێکردووەکەدا بگونجێت لە سیفەتی گڕی یان کپی یان لە ڕووی قەڵەوییەوە، بۆ نموونە:<br>دەس+ گر> دەزگر.<br>لێرەدا / س/ ی کپ گۆڕاوە بە /ز/ ی گڕ لە ئەنجامی کارتێکردنی /گ/ی گڕەوە. |
| particular phonetics | علم الاصوات الخاص | **فۆنەتیکی تایبەتی:**<br>بریتیە لە دیراسەکردنی دەنگەکانی زمانێکی تایبەت، ئەمەش بەرامبەر بە فۆنەتیکی گشتی دەوەستێت کە دیراسەی دەنگەکانی زمان دەکات بە شێوەیەکی گشتی. |
| pasigraphy | كتابة عالمية | **نووسینی جیهانی:**<br>ئەو جۆرە نووسینە یان ئەلفوبێیە دەگرێتەوە کە تایبەت نییە بە زمانێکی دیاری کراوەوە، واتە نووسینێکی گشتییە. |
| passive cavity | تجويف سلبي | **بۆشایی سەلبی:**<br>ئەو جۆرە بۆشاییەیە کە ڕاستەوخۆ بەشداری لە درکاندنی دەنگێکی زمانیدا ناکات. |

| | | |
|---|---|---|
| pause – pitch | نغم الوقف | **ئاوازەی وەستان:**<br>بریتیە لە بەرزبوونەوەی ئاوازەی ئاخاوتن لەناو ڕستەدا و پێش هەڵوەستەکردن juncture ، واتە لە کۆتایی هەڵوەستەکەدا. |
| peak of prominence | ذروة العلو (نواة المقطع) | **لووتکەی بەرزبوون (ناوکی بڕگە):**<br>ئەو بەشەیە لە بڕگە کە هێزێکی گونجاو وەردەگرێت، ئەمەش یان ڤاوڵ دەبێت یان ڤاوڵی دوولانە دەبێت، هەروەها بە syllabic peak ناودەبرێت. |
| penultimate syllable | المقطع قبل الاخير | **بڕگەی پێش کۆتایی:**<br>ئەو بڕگەیەیە کە دەکەوێتە پێش بڕگەی کۆتایی لە وشەیەکدا. |
| perfect alphabet | ابجدية مثالية | **ئەلفوبێی نموونەیی:**<br>ئەو ئەلفوبێیەیە کە هەر پیتێك بەرامبەر بە تاکە فۆنیمێك دەوەستێت، هەروەها بە ئەلفوبێی دەنگیphonetic alphabet ناو دەبرێت. |
| peripheral vowel | صائت خارجي | **ڤاوڵی دەرەوە:**<br>ئەو ڤاوڵەیە کە لە کاتی درکاندنیدا زمان لە ناوەندی زار دوور دەکەوێتەوەو بەڕادیەکی تەواو بەرز دەبێتەوە وەکو/ و، یٖ، ی/. |
| pharyngeal | حلقي | **گەروویی( دەنگ ):**<br>١-ئەو دەنگەیە کە لە کاتی درکاندنیدا زمان لە دیواری پشتەوەی گەروو دەکەوێت وەکو /ع، غ/.<br>٢-سیفەتە بۆ ئەو جۆرە دەنگە. |

| | | |
|---|---|---|
| pharyngeal cavity | التجويف الحلقي | **بۆشایی گەروو:**<br>ئەو بۆشاییەیە کە دەکەوێتە نێوان ڕەگی زمان و دیواری پاشەوەی گەروو، ئەمەش لەو بۆشاییانەیە کە تەزووی هەناسە بەناویدا تێپەڕ دەبێت. |
| Pharyngealized consonant | صامت محلق | **کۆنسنەنتی بەگەرووکراو:**<br>ئەو کۆنسنەنتەیەکە لە کاتی درکاندنیدا گەروو لەگەڵیدا کەمێك تەنگ دەبێتەوە. |
| pharynx | بلعوم | **گەروو:**<br>بۆشاییەکی فراوانە دەکەوێتە نێوان ڕەگی زمان و دیواری پشتەوەی گەروو کە لە بۆشایی لووتەوە دەست پێ دەکات تا دەگاتە قوڕگ. واتە دەکەوێتە سەرووی قوڕگەوە، هەروەها بە ئەندامێکی درکاندن لەقەڵەم دەدرێت و هەواش بەناویدا بەرەو زارو لووت تێدەپەڕێت. |
| phase of articulation | مرحلة النطق | **قۆناغی درکاندن:**<br>یەکێکە لە قۆناغەکانی درکاندنی دەنگ، قۆناغەکانیش بریتین لە ئامادەبوون on-glide پاشان درکاندن hold پاش ئەوەش خاوبوونەوە off – glide. |
| phonate | يصوت | **گڕ کردنی دەنگ:**<br>ئەوەی کە دەنگ گڕ دەکات. |
| phonation | تصويت | **بە گڕکردن:**<br>لەرینەوەی ژێیەکانی قوڕگ لە گەڵ درکاندنی دەنگدا کە دەبێتە هۆی گڕبوونی دەنگەکە. |

| | | |
|---|---|---|
| phone= speech sound | صوت<br>( صوت لغوي ) | **دەنگ ( دەنگە زمانی ):**<br>ئەو دەنگە ڕاستەقینەیەی کە قسەکەر لەکاتی ئاخاوتندا دەی دڕکێنێ هاوتایی ئەم دەنگە قەد دووبارە نابێت نە لە قسەکەرەکە خۆی نە لە قسەکەرێکی ترەوە، دەنگە کە لە سنووری ئەلۆفۆندا بەدەر دەکەوێت ئەمەش بە دەوری خۆی دەکەوێتە چوارچێوەی فۆنیمێکەوە. |
| phonematic unit | وحدة فونيمية | **یەکەی فۆنیمی:**<br>ئەو کەرەستە کەرتییەی segmental کە دەمێنێتەوە پاش لابردنی یان دابڕانی لە هەموو سیما ناکەرتییەکانی فۆنیمی supra segmental . |
| phoneme | فونيم<br>( صوت مجرد ) | **فۆنیم ( دەنگی ڕووت ):**<br>ئەو کۆمەڵە دەنگەیە کە لە ڕووی دڕکاندنەوە لێك دەچن، ئەو دەنگانەش بە شێوەیەکی تەواوکەری دابەش دەبن یان بە شێوەیەکی ئازاد دەگۆڕێن. فۆنیمیش چەمکێکی ڕووتە (ئەبستراکتە)، چونکە ئەوەی کە بەڕاستی دەدرکێت ئەلۆفۆنە نەك فۆنیم، لەبەر ئەوەی هەندێ زمانەوان فۆنیم بە دەنگێکی نموونەیی دادەنێن کە قسەکەر هەمیشە هەوڵدەدات لاسایی بکاتەوە. هەندێکی تر پێناسەی فۆنیم بەوە دەکەن کە بچووکترین یەکەی دەنگییەو بەهۆی ئەو یەکەیەش دەکرێ جیاوازی واتایی نێوان وشەکان دیاری بکرێت. فۆنیمیش دوو |

| | | |
|---|---|---|
| | | جــۆره: کــەرتی (segmental)و ناکـــەرتی (supra segmental)، جۆری یەکەم بریتیە لە ڤـاوڵ و کۆنســـنەنتەکان جـۆری دووەمـیش بریتیە لە هێزو ئاوازەو هەڵوەستە. |
| phonemically different | مختلف فونيميا | **جیاوازی فۆنیمی:** سـیفەتێکە بـۆ دەنگێـک کـە جیـاوازە لـە دەنگێکی تـر ئەو جیاوازیەش کار لە واتای وشـە زیـادە بکـات کـاتێ کـە یـەکێکیان لـە شـوێنی ئـەوەی تریـان بـەکاربێت وەکـو /د/و /ك/ لە وشەی ( دەم، کەم) دا. |
| phonemic analysis | تحليل فونيمي | **شیکردنەوەی فۆنیمی:** شـیکردنەوەی زمـان بـەهۆی بیسـتنەوە بـە مەبەستی دۆزینەوەی فۆنیمەکانی ئەو زمانـە، هـەروەها دەستنیشـان کردنـی ئەلۆفۆنـەکانی هـەر فۆنیمێـك لەگـەڵ دابـەش بـوونی هـەر ئەلۆفۆنێك. |
| phonemic arrangement | ترتيب فونيمي | **ڕیزبوونی ( ڕێکخستنی ) فۆنیمی:** بریتیـە لـە بەدوایـەك هـاتن و ڕیزبـوونی فۆنیمەکان لە سنووری بڕگەو وشـەکاندا بەپێی دەسـتوورو یاسـای تایبەتـەوە، ئەم یاسایانەش لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر دەگۆڕێت. |
| phonemic change | تغير فونيمي | **گۆڕانی فۆنیمی:** بریتیـە لـە گـۆڕانی فۆنیمێك بە فـۆنیمێکی تـر پـاش ئـەوەی زنجـیرە گـۆڕانێکی دەنگـی بەسـەردا دێـت بـەپێی قۆناغـەکانی گەشـەو گۆڕانی دەنگی کە ماوەیـەکی زۆری بەسـەردا تێدەپەڕێت. |

| | | |
|---|---|---|
| phonemic contrast | تقابل فونيمي | **بەرامبەربوونی فۆنیمی:** کـە دوو فـۆنیم لـە دوو شـوێنی وەك یـەك دەربکەون لە دوو وشەی جیاواز لە واتادا کە فۆنیمەکانی تریان وەك یەك بن، وەکو /چ/ و /د/ لەوشـەی (چـاو، داو)دا. ئـەم جـۆرە بەرامبەرییـەش وەکـو ڕێگەیـەکی گـرنگ بەکاردێت بۆ دۆزینەوەی فۆنیمەکانی زمان. |
| phonemic difference | فرق فونيمي | **جیاوازیی فۆنیمی:** بریتیە لە جیاوازی نێوان دوو دەنگ کە کار دەکاتـە سـەر واتـا، وەکـو جیـاوازی نێـوان /ب/و/ پ/ لـە زمـانی کوردیـدا، بـۆ نموونـە: (بـار: پـار)، هـەروەها بـەجیاوازی ئـەرکیش functional difference نـاو دەبرێـت، ئەمـەش بەرامبـەر بـە جیـاوازی دەنگـی phonetic difference یـان جیـاوازی نـا ئـەرکی ڕادەوەسـتێت، وەکـو جیـاوازی /س/و/ص/ لە زمانی کوردیدا. |
| Phonemic field work | بحث ميداني فونيمي | **توێژینەوەی مەیدانی فۆنیمی:** لێکۆلینەوەیـەکی زمـانی مەیدانییـە کـە بـە ڕێگەی قسەپێکەرانی زمانەکەوە کەرەستەی زمانی کۆدەکرێتەوە بە مەبەستی دۆزینـەوەو دەستنیشان کردنی فۆنیمەکانی ئەو زمانە. |
| Phonemicist | عالم ( محلل ) الفونيمات | **زانای ( شیکاری ) فۆنیمی:** هـەر زانایـەکی زمـانی کـە دیراسـەی فۆنیمـەکانی زمـان بکـات وەکـو یەکـە یـەکی ئەرکی ئەمەش جیاوازی لەگەڵ زانای دەنگدا |

| | | |
|---|---|---|
| | | (دەنگسان) phonetician هەیە، کە دیراسەی دەنگە ڕاستەقینەکان دەکات لە ڕووی درکاندن و گواستنەوەو هەست کردن بەو دەنگانە. |
| phonemic loan | دخيلة فونيمية | **فۆنیمی وەرگیراو:** هەر وشەیەك لە زمانێکی بێگانەوە وەکو خۆی وەربگیرێت و سیماو ئاکارەکانی فۆنیمی تایبەت بە زمانەکە بپارێزێت، واتە گۆڕانی فۆنیمی بەسەر وشەکەدا نەیەت. |
| phonemic notation | كتابة فونيمية | **نووسینی فۆنیمی:** نووسینێکی فراوانە، هێماکانی فۆنیمی تێدا بەکاردێت بۆ نیشاندانی ئاخاوتن، ئەم نووسینەش جیاوازی لەگەڵ نووسینی ئاساییدا هەیە، کە پیتی ئاسایی و ئەلفو بێی ئاسایی تێدا بەکاردێت، هەروەها جیاوازی لەگەڵ نووسینی دەنگیدا هەیە کە هێماکانی ئەلۆفۆنی تێدا بەکاردێت، واتە پێك هاتووە لە هێماکانی فۆنیمی لەگەڵ سیماکانی دەنگی وەك لووتی و درێژی و گڕوکپی بۆ زیاد دەکرێت. |
| phonemic opposition | تقابل فونيمي | **بەرامبەر بوونی فۆنیمی:** بڕوانە زاراوەی phonemic contrast . |
| phonemic reference | دلالة فونيمية | **هێماکردنی فۆنیمی:** هەر گرافیمێك (پیتێك) بە تەنیا هێما بۆ فۆنیمێك بکات، وەکو گرافیمی <ب> کە هێما بۆ فۆنیمی /ب/ دەکات لە زمانی کوردیدا. |
| phonemics | علم | **زانستی فۆنیمەکان:** |

| | | |
|---|---|---|
| | الفونيمات | ١-لقێکه له زانستی زمان، له جیاوازی ئەرکی نێوان دەنگەکان دەکۆڵێتەوە، واتە دیراسەی فۆنیمەکانی زمان دەکات پاش دۆزینەوەی فۆنیمەکان و دیاری کردنی ئەلۆفۆنەکانی هەر فۆنیمێك لەگەڵ دابەش بوونی هەر ئەلۆفۆنێك، هەروەها بە phonematicsیش ناودەبرێت.<br>٢-بریتیە لە پێکهاتەی فۆنیمی زمانێك. |
| phonemic script | كتابة فونيمية | **نووسینی فۆنیمی:**<br>بڕوانە زاراوەی phonemic notation. |
| phonemic set | استعداد فونيمي | **ئامادەیی فۆنیمی:**<br>ئەوتوانایەی کە مرۆڤ هەیەتی بۆ جیاکردنەوەو بەرهەمهێنانی فۆنیمەکانی زمان بە شێوەیەکی ئاسان، ئەمەش یەکێکە لەو توانایانەی کە خوای گەورە بە مرۆڤی بەخشیوە. |
| phonemic stratum | طبقة فونيمية | **چینی (ئاستی) فۆنیمی:**<br>بریتیە لە ئاستی فۆنیمی وشە یان ڕستە کە جیاوازی لەگەڵ ئاستەکانی دەنگی و مۆرفیمی و سینتاکسی و واتاییدا هەیە. |
| phonemic stress | نبرة فونيمية | **هێزی فۆنیمی:**<br>ئەو هێزەیە کە ئەرکی فۆنیم دەبینێ، ئەگەر پلەی هێزەکە بگۆڕێت یان لە برگەیەکەوە بچێتە برگەیەکی تر لە هەمان وشەدا دەبێتە هۆی گۆڕینی واتای وشەکە، بۆ نموونە:-<br>دەَزوو : خێراکە    وَردە : درشت نیە<br>دەزووَ : داو    وردەَ : پارەی وردە |

| | | |
|---|---|---|
| phonemic structure | تركيب فونيمي | **پێکهاتەی فۆنیمی:**<br>ئەو لیستەیە کە فۆنیمەکانی زمانێکی تێدایە هەروەها ئەلۆفۆنەکانی هەر فۆنیمێك لەگەڵ وەسف کردنی هەر ئەلۆفۆنێك و دابەشبوونی ئەلۆفۆنەکانی تێدا خراوەتە ڕوو، بێگومان پێکهاتەی فۆنیمی لە زمانێکەوە بۆزمانێکی تر دەگۆڕێت. |
| Phonemic system | النظام الفونيمي | **سیستەمی فۆنیمی:**<br>ئەوسیستەمەیە کە فۆنیمەکانی تێدا دابەش دەکرێتە سەر سەرەتاو ناوەڕاست و کۆتایی وشە، هەروەها سیستەمەکە کۆبوونەوەی ڤاوڵــــــەکان و کۆنســـــــنەنتەکان و فۆنیمەکەرتییەکان و ناکەرتییەکان دەگرێتە خۆی، ئەمەش لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر جیاوازی هەیە. |
| phonemic transcription | كتابة فونيمية | **نووسینی فۆنیمی:**<br>ئەو نووسینەیە کە هێماکانی فۆنیمی تێدا بەکاردێت و لە نێوان دوو هێڵی بەم جۆرە/ / دەنووسرێت بۆ ئەوەی لە نووسینی دەنگی یان ئەلۆفۆنی جیابکرێتەوە کە لە نێوان دوو کەوانەی ڕاستدا بەم جۆرە [ ] دەنووسرێت، بڕوانە phonemic notation . |
| phonemic different | مختلف صوتيا | **جیاوازی دەنگی:**<br>دەنگێك لە سیمایەکیدا جیاوازی لە گەڵ دەنگێکی تردا هەبێت، ئەو جیاوازییەش کار لەواتا ناکات، وەکو [ت]ی هائی و [ت]ی |

| | | |
|---|---|---|
| | | وەستاو، ئەم جیاوازییە بەجیاوازی دەنگی یان ئەلۆفۆنی یان جیاوازی نا ئەرکی ناو دەبرێت، ئەمەش پێچەوانەی جیاوازی فۆنیمییە کە دەبێتە هۆی گۆڕینی واتا. |
| phonemic alphabet | ابجدية صوتية | **ئەلفوبێی دەنگی:** ئەو ئەلفوبێیەیە کە هەر پیتێك گوزارشت لە دەنگێك دەکات، واتە بۆ هەر دەنگێك پیتێك دادەنرێت، هەروەها بە ئەلفوبێی نموونەیی ideal alphabet ناودەبرێت، ئەلفوبێی کوردیش تاڕادەیەك بە ئەلفوبێی دەنگی دادەنرێت. |
| phonetic change | تغير صوتي | **گۆڕانی دەنگی:** ١-ئەو گۆڕانەیە کە بەسەر دابەش بوونی ئەلۆفۆنەکانی فۆنیمێکدا دێت، بە پێی گەشەو گۆڕانی مێژوویی زمان، هەروەها ئەم گۆڕانە بە گۆڕانی ئەلۆفۆنی allophonic change ناو دەبرێت. ٢-بریتیە لە گۆڕانی دەنگی فۆنیمێك بێ ئەوەی بە فۆنیمێکی تر بگۆڕێت، وەکو /ت/ لە وشەی (تاڵ)دا قەڵەو دەبێت و هەر لە سنووری فۆنیمی /ت/یش دەمێنێتەوە. |
| phonetic context | سياق صوتي | **سیاقی دەنگی:** بریتیە لە ژینگەی دەرکەوتنی دەنگێك لە گەڵ دەنگەکانی دەوروبەریدا بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ. ئەو دەنگانەش زۆر جار کار لە دەنگەکە دەکەن و گۆڕانی بەسەردا دێنن وەکو گۆڕانی گونجان و |

| | | |
|---|---|---|
| | | نەگونجانی دەنگەکان. |
| phonetic evolution | تطور صوتي | **پەرەسەندنی دەنگی:** بریتیە لە گەشەو گۆڕانی دەنگەکانی زمان بە تێپەڕبوونی کات و بەپێی یاسای نەگۆڕو چەسپاوەوە. |
| phonetic habit | عادة صوتية | **نەریتی دەنگی:** بریتیە لە نەریتی تایبەتی کە سێك لە درکاندنی ئەلۆفۆنێکدا بەشێوازێکی تایبەت. |
| phonetician= phoneticist | عالم الاصوات | **دەنگساز ( زانای دەنگ ):** ئەو کەسەیە کە شارەزایی و پسپۆری لەزانستی دەنگدا هەیە، بڕوانە زاراوەی دەنگسازی phonetics. |
| phoneticization | تحويل صوتي<br>كتابة صوتية | بۆ دوو مەبەست بەکاردێت:<br>**١-گواستنەوەی دەنگ**<br>**٢-نووسینی دەنگی:**<br>ئەو نووسینەیە کە هێماکانی ئەلۆفۆنی تێدا بەکاردێت و لە نێوان دوو کەوانەی بەم جۆرە [ ] دەنووسرێت، ئەمەش جیاوازی لەگەڵ نووسینی فۆنیمیدا هەیە. |
| phonetic law= sound law | قانون صوتي | **یاسای دەنگی:** ئەو یاسایەی کە گەشەو گۆڕانی مێژوویی لە زمان نیشان دەدات بە تایبەتی ئەو گۆڕانانەی کە لە دەنگەکانی زماندا ڕوودەدات، وەکو یاسای گریم Grimm و یاسای ڤێرنێر Verner . |
| phonetic notation | كتابة | **نووسینی دەنگی:** |

| | | |
|---|---|---|
| | صوتية | ئەو نووسینەیە کە هێماکانی ئەلۆفۆنی تێدا بەکار دێت، ئەمەش بریتیە لە هێماکانی فۆنیمی لەگەڵ ئەو سیما لاوەکییانەی کە دەنگەکان بەخۆیانەوە دەگرن وەکو درێژو پقەداری (هایئەتی) دەنگ، دیارە ئەم جۆرە نووسینە وردەکاری و زانیاری دەنگی زیاتر تێدا تۆمار دەکرێت وەك لە نووسینی فۆنیمیدا هەیە، هەروەها ئەم نووسینە بە نووسینی ئەلۆفۆنیش ناو دەبرێت. |
| phonetics | علم الاصوات | **دەنگسازی ( فۆنەتێك ):**<br>لقێکە لەزانستی زمان، لە دەنگەکانی زمان دەکۆڵێتەوە لە ڕووی چونیەتی درکاندن و گواستنەوەو هەست کردن بەو دەنگانە، ئەم زانستەش دەکرێت بە چەند بە شێکەوە، وەك فۆنەتیکی درکاندن و فۆنەتیکی فیزیکی و فۆنەتیکی بیستن و فۆنەتیکی تاقیکردنەوەو فۆنەتیکی مێژوویی و فۆنەتیکی وەسفی. |
| phonetic sign | رمز صوتي | **هێمای دەنگی:**<br>بڕوانە زاراوەی **phonetic symbol**. |
| phonetic similarity | تشابه صوتي | **لێکچوونی دەنگی:**<br>ئەمەش چەند جۆرێك لەلێکچوون بەخۆیە دەگرێت، وەك:<br>١-لێکچوونی سازگەی درکاندنی دوو دەنگ وەکو [ب]و [م] کە لەسیفەتی لێویدا هاوبەشن.<br>٢-لێکچوونی دوو دەنگ لە ڕووی چۆنیەتی درکاندنیانەوە، وەکو [ب]و [ك] کە دوو |

| | | |
|---|---|---|
| | | دەنگی گیرن (وەستاون).<br>٣-لێکچوونی سازگەو چۆنیەتی درکاندنی دوو دەنــگ وەکـــو [ت]و [د] لێکچـــوونی دەنگــیش یەکێکــە لــە مەرجــەکانی ئــەو ئەلۆفۆنانـەی کـە سـەر بـە فـۆنیمێکن یـان بـۆ فۆنیمێك دەگەڕێنەوە. |
| phonetics of juncture | علم الاصوات المتصلة | **فۆنەتیکی ( ئاخاوتنی ) بەردەوام:**<br>بڕوانە زاراوەی combinatory phonetics . |
| phonetic spelling | كتابة صوتية | **نووسینی دەنگی:**<br>بڕوانە زاراوەی phonetic notation. |
| phonetic symbol | رمز صوتي | **هێمای دەنگی:**<br>هێمایــەکی نووســینە بــۆ دەنگێــك یــان ئــەلۆفۆنێك، ئەمــەش وردەکــاری زیــاترە لــە هێمـای فـۆنیمی، هـەروەها هێمـای دەنگی لـە نێــوان دوو کەوانــەی بــەم شــێوەیە [ ] دەنووسـرێت، بـەڵام هێمـای فـۆنیمی لـەنیوان دوو هێڵی بەم شێوەیە / / دەنووسرێت. |
| phonetic variant | متغير صوتي | **گۆڕاوی دەنگی ( ئەلۆفۆن ):**<br>بڕاوانە زاراوەی ئەلۆفۆن allophone. |
| phonic | صوتي | **دەنگی:**<br>ئەوەی پەیوەندی بە دەنگەوە phone هەیە. |
| phonic medium | واسطة صوتية | **هۆکاری دەنگی:**<br>ئاخـــاوتن وەك ڕێگەیـــەك یـــان هۆکارێـــك لەهۆکــارەکانی دەربڕینی زمانیدا بەکار بێت. |
| phonics | علم | وەك زاراوەیەك بۆ دوو مەبەست بەکاردێت:<br>١-**دەنگسازی ( فۆنیکس ):** |

| | | |
|---|---|---|
| | الاصوات الطريقة الصوتية | بروانە زاراوەی phonetics.<br>**٢-ڕێگەی دەنگی:**<br>ڕێگەیەکە بۆ فێرکردنی خوێندنەوە بۆ دەست پێکەران بەکاردێت، کە بە فێرکردنی دەنگەکان (پیتەکان) دەست پێ دەکات. |
| phonic sentence | جملة صوتية | **ڕستەی دەنگی:**<br>ئەو ڕستەیەی کە لەسەر شێوەی دەنگەکانی لە قسەکەرەوە گوێمان لێ دەبێت، ئەمەش بەرامبەر بە ڕستەی نووسراو graphic sentence دەوەستێت. |
| phonic substance | المادة الصوتية | **کەرەستەی دەنگی:**<br>بریتیە لە دەنگەکانی زمان کە لە کاتی ئاخاوتندا دەی بیستین. |
| phonogram | رمز كتابي<br><br>رسم الصوت | ئەم زاراوەیە بۆ دوو مەبەست بەکاردێت:<br>**١-هێمای نووسین:**<br>بریتیە لە هێمای نووسراوی دەنگێك یان ئەلۆفۆنێك یان فۆنیمێك یان وشەیەك.<br>**٢-وێنەی دەنگ:**<br>بریتیە لە وێنەیەکی بەیانی بۆ درکاندنی دەنگێك کە بە ئامێرێکی ئەلکترۆنی تایبەت تۆمار دەکرێت. |
| phonography | كتابة صوتية | **نووسینی دەنگی:**<br>دەنگەکانی زمان بەهێماکانی نووسین نیشان بدرێت لەسەر ئەو بنەمایەی کە بۆ هەر دەنگێك هێمایەك دابنرێت، هەروەها ئەم نووسینە بە نووسینی ئەلفوبێیی ناو دەبرێت، ئەمەش جیاوازی لەگەڵ نووسینی |

| | | |
|---|---|---|
| | | وشـەییدا logography هەیـە کـە هێماکـەی بەرامبەر بە وشەیەکی تەواو دادەنرێت. |
| phonological change | تغير فونيمي | **گۆڕانی فۆنۆلۆجی ( فۆنیمی ):**<br>بریتیە لە گۆڕانی ژمارەی فۆنیمەکانی زمانێك یـان گـۆڕان لەدابـەش بـوونی فۆنیمەکانیـدا ڕوودەدات بـــە پێـــی قۆناغـــەکانی گەشـــەو گۆڕانی مێژوویی زمانەکە. |
| phonological component | مكون فونولوجي | **پێکهێنی فۆنۆلۆجی:**<br>یەکێکـە لـە پێکهێنـەرەکانی ڕێزمـان، ئـەو یاسایانە بەخۆیـەوە دەگرێـت کـە لـە ئاسـتی ڕۆنانی دەرەوەی ڕستەدا کار دەکەن. |
| phonological criteria | معيار فونولوجي | **پێوانەی فۆنۆلۆجی:**<br>ئـــەو پێوانەیـــەی لـــە پێناســـینی ڕســـتەدا بەکاردێت کە بەرێگـەی فۆنیمـە کەرتییـەکان و فۆنیمە ناکەرتیەکانەوە ئەنجام دەدرێت. |
| phonological item | مفردة فونيمية | **یەکەی فۆنۆلۆجی ( فۆنیم ):**<br>بڕوانە زاراوەی phoneme. |
| phonologically conditioned | مشرط فونيميا | **مەرجی فۆنۆلۆجی:**<br>سـیفەتە بـۆ ئـەلۆمۆرفێك کـە ژینگـەی دەنگـی کار دەکاتە سەر دابەش بوونی. هـەر وەکو لـە دابەشـبوونی ئەلۆمۆرفـەکانی ناسـیاری لـە زمـانی کوردیـدا بەرچـاو دەکـەوێت ئەگـەر دەنگی کۆتایی وشەکە کۆنسنەنت بێـت ئـەوا ئـەلۆمۆرفی ناسـیاری (ەکـە) دەبێـت، ئەگـەر بێـتو وشـەکە بـە دەنگـی ڤـاولْ کۆتـایی بێـت ئەوا ئەلۆمۆرفەکە (کە) دەبێت. |
| phonological structure | تركيب | **پێکهاتەی فۆنۆلۆجی:** |

| | | |
|---|---|---|
| | فونولوجي | بریتیە لە ئاستی فۆنۆلۆجی (فۆنیمی) ڕستە کە جیاوازی لەگەڵ ئاستەکانی دەنگی و مۆرفۆلۆجی و سینتاکسی و واتاییدا هەیە. |
| phonological word | كلمة فونيمية | **وشەی فۆنۆلۆجی:** ئەو وشەیەی کە وەکو خۆی دەی درکێنین، ئەمەش لەگەڵ وشەی نووسراودا orthographical word جیاوازی هەیە. |
| phonological syntax | نحو فونيمي | **فۆنۆلۆجی سینتاکسی:** بریتیە لە شیکردنەوەی سینتاکسی کە پشت بە سیستەمی فۆنۆلۆجی (فۆنیمی) دەبەستێت لە شیکردنەوەی ڕستە یان زماندا. |
| phonology | علم الفونيمات علم الاصوات | **١-زانستی فۆنیمەکان:** بڕوانە زاراوەی phonemics. **٢-دەنگسازی:** بڕوانە زاراوەی phonetics. |
| phonatactics | دراسة تتابع الفونيمات | **دیراسەکردنی بەردەوامی فۆنیمەکان:** بریتیە لە دیراسە کردنی ژینگەی دەنگی هەر فۆنیمێك بە پێی شوێنی دەرکەوتنی ئەو فۆنیمە لەگەڵ ئەو دەنگانەی کە لە دەوروبەریدا دەردەکەون. |
| physical element | عنصر مادي | **کەرەستەی مادی ( خاو ):** ئەو کەرەستە دەنگییەی کە لە دەربڕینی زماندا هەیە و بەکار دێت، ئەمەش بریتیە لە دەنگەکانی زمان کە بەرەودوای یەك دێن بۆ دروست کردنی ئەو ڕستانەی کە گوێمان لێ دەبێت. |

| | | |
|---|---|---|
| physical phonetics | علم الاصوات الفيزيائي | **فۆنەتیکی فیزیکی:** لقێکە لە فۆنەتیکی تاقیکردنەوە (تجریبی) لە سەرچاوەی دەنگ و گواستنەوەو فراوانی لەرە لەرو پێوانەی لەرەکان و شەپۆلەکانی دەنگ و جۆری شەپۆلەکان دەکۆڵێتەوە، جیاوازی فیزیکی (ماددی) نێوان دەنگەکان نیشان دەدات لە ڕووی بەرزی و پلەو جۆرەوە، هەروەها لە زرینگانەوەو پاڵاوتن و کۆمەڵە دەنگ دەکۆڵێتەوە، بڕوانە فۆنەتیکی ئەکۆستیکی acoustic phonetics. |
| physiological phonetics | علم الاصوات الوظيفي | **فۆنەتیکی ئەرکی:** لقێکە لە دەنگسازی لە ئەندامانی ئاخاوتن و بەرهەمهێنانی دەنگەکانی زمان و جۆری دەنگەکان دەکۆڵێتەوە سەبارەت بە چۆنیەتی درکاندن و ئەو ئەندامانەی کە بەشداری لە درکاندن دەکەن، هەروەها بە فۆنەتیکی درکاندن articulatory phonetics ناو دەبرێت. ئەم زانستە سود لە توانی ئامێرەکانی فۆنەتیکی تاقیکردنەوە وەردەگرێت بۆ وەسف کردنی سازگەی دەنگەکان. |
| physology of hearing | فسيولوجية السمع | **فیسیۆلۆجی بیستن:** یەکێکە لەو بوارانەی کە فۆنەتیکی بیستن لێی دەکۆڵێتەوە، ئەم زانستەش دیراسەی پرۆسەی بیستن دەکات لەگەڵ چۆنیەتی هەست کردن بە ڕێگەی بیستنەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| physio-phonetics | علم الاصوات الوظيفي | **فۆنەتیکی ئەرکی:**<br>بڕوانە زاراوەی physiological phonetics . |
| pictogram= pictograph | رمز تصويري | **هێمای وێنەیی:**<br>ئەو هێما نووسراوەیە کە گوزارشت لە شتێك یان وشەیەك دەکات وەك هێماکانی هاتوچۆ. |
| pitch | نغم (درجة الصوت) | **ئاوازە ( پلەی دەنگ ):**<br>فۆنیمێکی ناکەرتییە پلەکەی بەپێی ژمارەی لەرینەوەی ژێیەکانی قورگ لە چرکەیەکدا دیاری دەکرێت، واتە بەپێی ئەو لەرە لەرانەی کە پشت بە پلەی گرژی ژێیەکان دەبەستێت، ئەوەی ئاشکرایە کە گوێی مرۆڤ ئەو لەرەلەرانە دەبیستێ ئەگەر بیتو لە بیست لەرە لە چرکەیەکدا کەمتر نەبێت. |
| pitch level | مستوى النغم | **ئاستی ئاوازە:**<br>بریتیە لە پلەی ئەو ئاوازەیەی کە هەر چەندە ژمارەی لەرەکانی دەنگ زیاد بێت پلەکەی بەرز دەبێتەوە، هەرچەندە ژمارەی لەرەکانی دەنگ کەم بێت پلەکەی نزم دەبێتەوە، ئاوازەش چوار جۆر پلەی بۆ دیاری کراوە بەم شێوەیە: ئاوازەی نزم low ، ئاوازەی ئاسایی normal، ئاوازەی بەرز high لەگەڵ ئاوازەی سەرووی بەرزەوە extra – high . |
| pitch phoneme | فونيم نغمي | **فۆنیمی ئاوازەدار:**<br>بڕوانە زاراوەی ئاوازە pitch. |
| plene writing | كتابة صامتية | **نووسینی کۆنسنەنتی:**<br>ئەو جۆرە نووسینەیە کە کۆنسنەنت و ڤاوڵە |

| | | |
|---|---|---|
| | | درێژەکانی تێدا دەردەکەوێت و قاوڵە کورتەکانی تێدا دەرناکەوێت، یان نیشانەی سەروبۆری تایبەتی بۆ دادەنرێت، وەکو لە نووسینی عەرەبی و عیبریدا بەرچاو دەکەوێت. هەندێ جار ئەم نووسینە بەنووسینی ناتەواو defective writing ناودەبرێت. |
| plosion= explosion | انفجار | **تەقین (گیر):**<br>بریتییە لە دەرچوونی یان دەرپەڕینی ئەو هەوایەی کە بەربەست کراوە لە کاتی درکاندنی دەنگێکی گیری وەستاودا بڕوانە زاراوەی stop. |
| plosive= stop | انفجاري | **تەقیو، گیر (دەنگ):**<br>١-ئەو دەنگەیە کە تەزوی هەناسە لەگەڵیدا گیر دەبێت و پاشان بەشێوەی تەقینەوەیەکی کەم دەردەچێت وەکو/ ب، پ، ك، گ، ت، د/.<br>٢-سیفەتە بۆ ئەو جۆرە دەنگە. |
| plosive stop | صوت انفجاري | **دەنگی گیری تەقیو:**<br>بڕوانە زاراوەی پێشوو plosive. |
| plus juncture | فاصل موجب | **هەڵوەستەی موجەب:**<br>فۆنیمێکی ناکەرتییە هێماکەی بەم جۆرەیە/+/ هەمیشە لە نێوان هێزی دووەم و هێزی سەرەکیدا بەکاردێت، هەروەها کار لە دەنگەکانی پێش و پاشی خۆی دەکات، بۆ نموونە دەنگی گیری هائی لە پێش هەڵوەستەی موجەبدا هائییەکەی نامێنێت و دەبێتە دەنگێکی گیر وەکو /ك/ لەوشەی (چاك |

| | | |
|---|---|---|
| | | /+/ بوون)، دیسانەوە دەنگی نیمچە ڤاوڵ درێژ دەبێتەوە کاتێ کە دەکەوێتە پێش هەڵوەستەی موجەبەوە وەك /ی/ لە وشەی (نای /+/ گرم)، بەڵام کە دەنگێکی گیری کپ یان نیمچە ڤاوڵ دەکەونە پاش هەڵوەستەی موجەبەوە دەنگە گیرەکە سیفەتی هائییە وەردەگرێت و نیمچە ڤاوڵەکەش کورت دەبێتەوە وەکو (چا /+/ یەکە). هەروەها هەڵوەستەی موجەب بەهەڵوەستەی کراوەش open juncture ناودەبرێت. |
| **point of articulation** | **مكان النطق** | **شوێنی دركاندن ( سازگە ):** ئەندامێکی دركاندنی چەسپاوە بەشداری لە پرۆسەی دركاندنی دەنگەکانی زمان دەکات کاتێ کە دەلکێت یان نزیك دەبێتەوە لە ئەندامێکی تری دركاندنی چالاك کە بە درکێنەر articulator ناو دەبرێت. ئاسایی درکێنەر لە خوارەوە دەبێت و سازگەی دركاندنیش دەکەوێتە سەرەوە. زمان و لێوی خوارەوە نموونەی درکێنەرن، بەڵام لێوی سەرەوە و دانەکان و مەلاشووی ڕەق. . . هتد دەبن بە سازگەی دركاندن. |
| **polyphone** | **حرف متعدد الاصوات** | **پیتی فرە دەنگ:** ئەو پیتەیەکە بۆ چەند دەنگێکی جیاواز لەزمانێکدا بەکاردێت وەکو پیتی <ی> و <و> لەزمانی کوردیدا کە بۆ دوو دەنگی جیاوازی /ی/، و/ی ڤاوڵ و / y – w/ نیمچە |

| | | |
|---|---|---|
| | | قاولْ دانراون و بەکاردێن. |
| polyphonic | متعدد الاصوات | **فرە دەنگ:**<br>سیفەتە بۆ ئەو پیتەی کە چەند دەنگێك نیشان دەدات بڕوانە زاراوەی پێشوو poly phone. |
| polysyllabic | متعدد المقاطع | **فرە بڕگەیی:**<br>هەر وشەیەك لەسێ بڕگە یان زیاتر پێك بێت، وەکو وشەی (هەرمێ لاسورە) کە لە پێنج بڕگە پێك هاتووە. |
| post – alveolar | بعديلثوي | **پاش- پووکی (دەنگ):**<br>ئەو دەنگەیە کە سازگەکەی دەکەوێتە پاش پووکی دانەوە، واتە بەرەو مەلاشووی ڕەق دەڕوات. |
| post –dantal | خلفي اسناني | **پاش ددانی (دەنگ):**<br>ئەو دەنگەیە کە لە ئاکامی لێکەوتنی زمان بە دیوی ناوەوەی ددان دروست دەبێت، هەروەها بە پووکیش alveolar ناو دەبرێت وەکو/ ت، د، س، ز/. |
| post-junctural | بعدي فاصلي | **پاش هەڵوەستە:**<br>سیفەتە بۆ ئەو دەنگەی کە دەکەوێتە پاش هەڵوەستەی موجەبەوە ئەم شوێنەش کار لە دەنگەکە دەکات، ئەگەر دەنگەکە گیری کپ بێت ئەوا دەیکاتە دەنگێکی پفەدار (هائی)، یان دەنگەکە نیمچە قاولْ بێت ئەوا کورتی دەکاتەوە، بڕوانە زاراوەی plus juncture. |
| post – oral | خلفي فمي | **پاشەوەی زار (دەنگ):**<br>ئەو دەنگەیەکە لە کۆتایی زارەوە دەردەچێت، |

| | | |
|---|---|---|
| | | واتە دەنگێکی نەرمە مەلاشوویيە velar یان زمانۆچکەییە uvular. |
| post- palatal | خلفي غاري | **پاشەوەی مەلاشووی ڕەق:** ئەو دەنگەیە کە سازگەکەی دەکەوێتە کۆتایی مەلاشووی ڕەقەوەو لە نزیك سەرەتای دەست پێکردنی مەلاشووی نەرمەوە. |
| post velar | خلفي طبقي | **پاشەوەی مەلاشووی نەرم:** ئەو دەنگەیە کە سازگەکەی دەکەوێتە پاش مەلاشووی نەرمەوە. |
| pre-dental | قبل اسناني | **پێش ددانی:** ئەو دەنگەیەکە لە ئەنجامــی لێکەوتنی نوکی زمان لەدانەکانی سەرەوە دروست دەبێت. |
| preliminary transcription | كتابة مبدئية | **نووسینی سەرەتایی:** نووسینێکی فۆنیمی کاتییە کە لە ئاخاوتنی زمانێکدا بە ڕێگەی بیستنەوە تۆمار دەکرێت، تاکو بەشێوەیەکی کۆتایی فۆنیمەکانی ئەو زمانە دەستنیشان دەکرێت، هەروەها ئەم نووسینە لە ژێر چاودێریو ڕاست کردنەوە دەبێت پاش دیاری کردنی فۆنیمەکانی بە شێوەیەکی تەواو و یەکجارەکی. |
| prenasalized stop | انفجاري سابق الغنة | **گیری پێش بەلوت کراو:** ئەو دەنگە گیرەیە کە لەگەڵ درکاندنیدا بە ماوەیەکی کەم ڕێڕەوی زاری دادەخرێت پێش داخستنی ڕێڕەوی لووتی. |
| pre palatal | قبل غاري | **پێش مەلاشووی ڕەق:** ئەو دەنگەیە کە لە ئەنجامی لێکەوتنی |

| | | |
|---|---|---|
| | | ناوەڕاستی زمان بە بەشی پێشەوەی مەلاشووی ڕەق دروست دەبێت. |
| prescriptive phonetics | علم الاصوات الفرضي | **فۆنەتیکی گریمانەیی:** ئەو زانستەیە کە بایەخ بە وەسف کردنی دەنگەکانی زمان دەدات وەکو ئەوەی کە پێویستە بدرکێت، نەك وەك ئەوەی کە بە ڕاستی دەدرکێت هەروەها بە فۆنەتیکی پێوانەیی normative phonetics ناو دەبرێت. |
| pressure stop | انفجاري طارد | **گیری دەرچوو:** بڕوانە زاراوەی egressive stop. |
| prevelar | قبل طبقي | **پێش مەلاشووی نەرم:** ئەو دەنگەیە کە سازگەکەی دەکەوێتە پێشەوەی مەلاشووی نەرم، واتە دەکەوێتە نزیك سنووری جیابوونەوەی نێوان مەلاشووی ڕەق و مەلاشووی نەرمەوە. |
| primary accent | نبرة رئيسية | **هێزی سەرەکی:** بڕوانە زاراوەی primary stress. |
| primary phoneme | فونيم اولي | **١-فۆنیمی سەرەکی:** ئەو فۆنیمە سادەیەیە کە تەنیا لە دەنگێك پێك دێت، هەروەها بە فۆنیمی سادەش simple phoneme ناودەبرێت.<br>٢-فۆنیمی بنجی واتە ئەو فۆنیمانەی کە ڤاولّ و کۆنسنەنتەکان دەگرێتەوە، هەروەها بە فۆنیمە کەرتییەکان segmental phoneme ناودەبرێن. |

| | | |
|---|---|---|
| primary stress | نبرة رئيسية | **هێزی سەرەکی:**<br>توندترین هێزە، گرنگترین وشە لەڕستەدا ئەم هێزە وەردەگرێت، یان ئەو وشەیەی کە دەکەوێتە، کۆتایی ڕستەوە هەروەها توندترین هێز وشەیەك وەری دەگرێت ئەگەر بێتو بە تەنیا گۆبکرێت، ئەمەش بەفۆنیمێکی نا کەرتی دادەنرێت و هێماکەی بەم جۆرەیە / / بڕوانە زاراوەی stress. |
| primary vowel= cardinal vowel | صائت رئيسي | **ڤاوڵی سەرەکی:**<br>ڤاوڵێکی سادەی کورتە، بەمەش لە ڤاوڵە لێکدراو و درێژەکان جیادەکرێتەوە بڕوانە زاراوەی cardinals. |
| progressive assimilation | مماثلة اتباعية | **گونجانی بەرەو پێش:**<br>بریتیە لە گۆڕانی دەنگێك بۆ ئەوەی لەگەڵ دەنگێکی پێش خۆیەوە بگونجێت، واتە دەنگی پێشەوە کاری کردۆتە سەر دەنگی دواوە، وەکو گۆڕانی /د/ بە /م/ لەوشەی (لێم دا >لێم ما) لەزاری سلێمانیدا. |
| progressive dissimilation | مغايرة اتباعية | **نەگونجانی بەرەو پێش:**<br>بریتیە لە کارتێکردنی دەنگێك لە دەنگێکی پاش خۆیەوە کە دەبێتە هۆی دوورکەوتنەوەو نەگونجانی دوو دەنگەکە لەگەڵ یەکتردا. |
| prominence | علو، بروز | **بەرزبوون (دەرکەوتن):**<br>هەر دەنگێك یان بڕگەیەك یان وشەیەك لەڕووی هێزەوە یان ئاوازەوە بەرزتر بێت لەوانەی کە لەگەڵیدا دەرکەوتوون. |

| | | |
|---|---|---|
| pronounceability | سهولة تلفظ | **ئاسانی گۆکردن:**<br>بریتیە لەو کۆمەڵە دەنگەی کە گۆکردنیان ئاسانە، ئەمەش یەکێکە لەو هۆکارانەی کە کاردەکەنە سەر گۆکردنی هێشووە دەنگ. |
| pronouncing dictionary | معجم التلفظ | **فەرهەنگی گۆکردن:**<br>ئەو فەرهەنگەیە کە تایبەتە بە دەرخستنی شێوەی گۆکردنی وشەکان، لێرەدا ئاسایی هەموو ئەو گۆکردنانە تۆمار دەکرێت کە لەوشەیەکدا بەکاردێت و لە زارێکەوە بۆ زارێکی تر جیاوازی هەیە. |
| pronounciation | تلفظ | **گۆکردن:**<br>بریتیە لەشێوەی گۆکردنی وشەیەك بە فۆنیمەکانییەوە لەگەڵ ئەو هێزانەی کە دەکەونە سەر وشەکەوە. |
| proportional opposition | تقابل تناسبي | **بەرامبەری رێژەیی:**<br>ئەوەیە کە دوو کۆمەڵە فۆنیم یان زیاتر لە دوو سیمای دەنگیدا بەرامبەر بەیەك بوەستن وەکو /د: ت- گ: ك - ب: پ/ لەسیمای گڕی و کپیدا بەرامبەر بەیەك دەوەستن. |
| prosioposis | ترخيم استهلالي | **لابردنی سەرەتایی:**<br>بریتیە لە لابردنی دەنگێك لە سەرەتای وشەدا. |
| prosodeme | فونيم فوقطعي | **فۆنیمی ناکەرتی:**<br>بڕوانە زاراوەی :<br>.suprasegmental phoneme |
| prosodic analysis | تحليل فوقطعي | **شیکردنەوەی ناکەرتی:**<br>شیکردنەوەی ئاخاوتن بۆ فۆنیمە |

| | | |
|---|---|---|
| | | کەرتییەکان و فۆنیمە ناکەرتییەکان لەگەڵ دانانی یان زیادکردنی سیما لاوەکییەکان بۆ هەر یەکێك لەو فۆنیمانە، ئەم شێوازە زمانەوانی ئینگلیزی فێرث بەکاری دەهێنا لەشیکردنەوەی فۆنیمەکاندا. |
| prosodic mark | رمز فوقطعي | **نیشانەی فۆنیمی ناکەرتی:** ئەو نیشانانەی کە بۆ فۆنیمە ناکەرتییەکان دادەنرێن، وەکو نیشانەی هێزو نیشانەی هەڵوەستەو نیشانەی ئاوازە. |
| prosodic phonetics | علم الاصوات الفوقطعية | **فۆنەتیکی ناکەرتی:** ئەو زانستەیە کە لە فۆنیمە ناکەرتییەکانی وەك هێزو ئاوازەو هەڵوەستە دەکۆڵێتەوە. |
| prosody | فونيم فوقطعي | **فۆنیمی ناکەرتی:** بڕوانە suprasegmental phoneme. |
| prosthesis= prothesis | اضافة استهلالية | **زیادکردنی سەرەتایی:** بریتیە لە زیادکردنی دەنگێك یان پێشگرێك لە سەرەتای وشەیەکدا بەمەبەستی ئاسان کردنی گۆکردن. |
| prothetic phoneme | فونيم اضافي استهلالي | **فۆنیمی زیادکراوی سەرەتا:** ئەو فۆنیمەی کە لە سەرەتای وشەدا زیادەکرێت بە مەبەستی ئاسانی درکاندنی وشەکە. |
| psychological phonetics | علم الاصوات النفسي | **فۆنەتیکی دەروونی:** وەك زانستێك لەو هۆکارە دەروونیانە دەکۆڵێتەوە کە کار دەکەنە سەر هەستی گوێگر لە بارەی بیستنی دەنگەکانی زمان، بەمەش نزیك دەبێتەوە لە فۆنەتیکی بیستن |

| | | |
|---|---|---|
| | | . auditory phonetics |
| psychological of hearing | سايكولوجية السمع | **سايكۆلۆجيەتی بيستن:**<br>يەكێكە لەو بوارانەی كە فۆنەتيكی دەروونیو دەروونزانـــی هەســـت پێكـــردن. لێـــی دەكۆڵێتەوە. |
| pulmonic cavity | تجويف رئوي | **بۆشايی سييەكان:**<br>ئـەو بۆشـاييانە دەگرێتـەوە كـە لەسـييەكانو بۆڕييـەكانی هەناسـەدا هەيـە، ئەمانـەش بـە دەوری خۆيـان كـار دەكەنـە سـەر دەنگـەكانی زمان. |
| pure phonetics | علم الاصوات البحث | **فۆنەتيكی تەواو:**<br>ئـەو زانسـتەيە كـە لـە پـۆل كردنـی دەنگـەكان دەكۆڵێتـــەوە لـــە ڕووی ماديیـــەوە هـــەروەها خاســـيەتەكانی دركانـــدنو لايـــەنی فيزيكـــی دەنگەكان تۆمار دەكات. |
| pure tone | نغمة نقية | **ئاوازەی خاوێن:**<br>دەنگێكـی سـادەی سـاكارە كـە لـە دەنگـی چەتاڵی زرينگان (شوكة رنانة) دەچێت. |
| pure vowel | صائت نقي | **ڤاوڵی خاوێن:**<br>ڤاوڵێكی سادەيە واتە لێكدراو نييە، هـەروەها بـە ڤـاوڵی يـەك لانـە mono phthong نـاو دەبرێـــتو بەرامبـــەر بـــە ڤـــاوڵی لێكـــدراو دەوەستێت. |

# - Q -

| | | |
|---|---|---|
| quadrisyllable | كلمة رباعية المقاطع | **وشەی چوار برگەیی:** ئەو وشەیەیە کە لەچوار برگە پێك دێت وەکو وشەکانی (گوڵە گەنم، سەرتاشخانە). |
| quantity = duration | مدة الصوت | **ماوەی دەنگ:** ئەو ماوەیەی کە ئەندامانی ئاخاوتنی تێدا لە سەر باری پێویست دەمێنێت بۆ درکاندنی دەنگێك. |
| quantity mark | علامة الطول | **نیشانەی درێژی:** ئەو نیشانەیەی کە درێژی یان کورتی دەنگ نیشان دەدات وەك ئەم نیشانەیەی [–] کە درێژی نیشادەدات و ئەمەش [-] کورتی نیشان دەدات. |
| Quinque-syllable | كلمة خماسية المقاطع | **وشەی پێنج برگەیی:** ئەو وشەیەیە کە لە پێنج برگە پێك دێت وەکو (کولێرە بە ڕون، هەڵگەڕانەوە). |

# - R -

| | | |
|---|---|---|
| r-colored vowel | صائت رائي | **ڤاولی رائی:**<br>ئەو ڤاوڵەی کە بە دەنگی (ر) ڕەنگ کراوە. |
| recessive stress | نبرة استهلالية | **هێزی سەرەتایی:**<br>ئەو هێزە سەرەکییەیە کە دەکەوێتە سەر برگەی یەکەمی وشە. |
| reciprocal assimilation | مماثلة تبادلية | **گونجانی ئاڵوگۆڕ:**<br>بریتیە لە کارتێکردنی دوو دەنگی دراوسێ لە یەکتر بە جۆرێك کە ببێتە هۆی گونجانی تەواو یان ناتەواوی دەنگەکان. |
| regression of stress | تراجع النبرة | **گەڕانەوەی هێز:**<br>بریتیە لە گواستنەوەی هێزی سەرەکی لە برگەیەکەوە بۆ برگەیەکی تری پاشەوە لە هەمان وشەدا. |
| regressive assimilation | مماثلة راجعة | **گونجانی بەرەو دواوە:**<br>بریتیە لە گۆڕانی دەنگێك بۆ ئەوەی لەگەڵ دەنگێکی پاش خۆیەوە بگونجێت، واتە گۆڕانەکە بەرەو دواوە ڕوودەدات، چونکە دەنگی دواوە کار لەدەنگی پێشەوە دەکات و دەیگۆڕێت، وەکو: سەرت داگرە> سەدداگرە لەگەڵت دێم> لەگەڵددێم. |
| regressive dissimilation | مغايرة راجعة | **نەگونجانی بەرەو دواوە:**<br>بریتیە لە گۆڕانی دەنگێك لە ژێر کارتێکردنی دەنگێکی پاش خۆیەوە بە جۆرێك کە ئەو گۆڕانە ببێتە هۆی زیادبوونی جیاوازی و نەگونجانی هەردوو دەنگەکە وەکو پاش شێو> پارشێو. |

| | | |
|---|---|---|
| release | استراحة | **پشوودان:**<br>گەڕانــەوەی ئەنــدامانی ئاخــاوتن بــۆ بــاری ئاسایی خۆیان پاش ئەوەی کە لە درکاندنی دەنگێکدا تەواودەبن. |
| resonance | رنين | **زرینگان:**<br>بریتیــە لــە لەراندنــەوەی تــەنێك لــە ئاکــامی کــارتێکردنی لەرینــەوەی تــەنێکی تــر، ئــەم بــارەش لــە دەنگــەکانی زمانــدا بــەر چــاو دەکەوێت کە بەهۆی کارتێکردنی لەرینــەوەی دەنگە ژێیەکان ڕوودەدات بەتایبەتی لەکاتی درکاندنی ڤاوڵەکان و کۆنسنەنتە گڕەکاندا. |
| resonance chamber | تجويف الرنين | **بۆشایی زرینگان:**<br>ئــەو بۆشــاییەی کــە هەواکــەی دەلەرێتــەوەو دەبێتە هۆی پەیدابوونی زرینگان ئەم بارەش لەگــەڵ چــەند دەنگێکــی زمانیــدا ڕوودەدات، وەکو بۆشایی زارو بۆشایی لووت و بۆشــایی گەروو. |
| resonant | رنان، رنيني | **زرینگاو( زرینگاوی ):**<br>ئەو دەنگەیە کە لەکاتی درکاندنیدا تــەزووی هەناسە ڕێگــەی لــێ ناگیرێــت، واتــە دەنگەکــە نــە گــیرەو نەخشــۆکە، جــۆری دەنگەکــەش لەسەر ئەو بۆشاییە دەوەستێت کە بەشداری لــە پەیــدابووی زرینگانەکــە دەکــات، ئــەویش بۆشایی ناو زارو لووت و گــەروو دەگرێتــەوە، دەنگــی ســەرەکیش لێــرەدا دەنگێکــی درێــژە پێدراوەو دەشــێ بۆ ماوەیەکی دیــاری نــەکراو درێــژەی پــێ بــدرێت، دەنگەکــەش یــان |

| | | |
|---|---|---|
| | | زرینگاوی لووتییه که ڕێڕەوی زاری به تەواوی دادەخرێت و ڕێڕەوی لووتی دەکرێتەوە وەکو / ن/و /م/ یان دەبێته دەنگێکی زرینگاوی لایی کە ڕێڕەوی زار له ناوەندەوە دادەخرێت وەکو دەنگی / ل، ڵ/ یان دەبێته دەنگێکی زرینگاوی ناوەندی کاتێ کە زار لە ناوەندییەوە دەکرێتەوە وەکو ڤاوڵەکان و نیمچه ڤاوڵەکان. بەرامبەر بەم جۆرە دەنگەش دەنگی نازرینگاو obstruent دەوەستێت. |
| resenate | يرن | **دەزرینگێ:**<br>ئەو تەنەی کە دەزرینگێ لە ئەنجامی کارتێکردنی لەرینەوەی تەنێکی تردا. |
| resonator | جسم رنان<br>(مضخم الصوت) | **تەنی زرینگاو (دەنگ گەورەکەر):**<br>ئەو بۆشاییەی یان تەنەی کە یارمەتی لەرینەوەی تەنێکی تر دەدات و دەبێتە هۆی زرینگانی یان گەورەکردنی (قەبەکردنی) دەنگەکە، ئەمەش بۆشاییەکانی ناو دەم و لووت و گەروو دەکرێتەوە. |
| retracted | مؤخر | **دواکەوتوو:**<br>سیفەتە بۆ ئەو دەنگەی کە سازگەکەی کەمێک بەرەو دواوە دەکشێ لەئەنجامی کارتێکردنی دەنگێکی دەوروبەردا، وەکو /ک/ لە وشەی / کێ/ دا بە بەراورد کردنی لەگەڵ /ک/ لە وشەی / کار/ دا. |
| retracting | تاخير | **دواخستن:**<br>بریتیه لە دواخستنی سازگەی دەنگێک لە |

| | | |
|---|---|---|
| | | ئەنجامی کارتێکردنی ئەو ژینگە دەنگییەی کە تێیدا دەردەکەوێت. |
| retroflex= cacuminal | ارتدادي ( التوائي ) | **هەڵگەڕاوە ( چەماوە ):** ئەو دەنگەیەکە نووکی زمانی تێدا دەچەمێتەوە بەرەو دواوە لەناو بۆشایی زاردا وەکو درکاندنی /r/ ی ئەمریکی. |
| retroflexion | ارتداد، التواء | **هەڵگەڕان، چەمان:** بریتییە لە درکاندنی دەنگێکی زمانی بە چەمانەوەی نووکی زمان بۆ پاشەوە، واتە هەڵگەڕانەوەی نووکی زمان بەرەو مەڵاشووی ڕەق. |
| rhythm | ايقاع | **ترپە ( رتم ):** بریتییە لە بەدوا یەك هاتنی ئاوازەی دەنگەکانی زمان، ئەمەش کاتێ ئەنجام دەدرێت کە جۆری دەرکەوتنی برگە هێزدارەکان و برگە بێ هێزەکان بەرەو دوای یەك بێن. |
| rhythmic | ايقاعي | **ترپەدار ( رتمدار ):** ئەوەی کە پەیوەندی بە ترپەوە هەیە، یان سیفەتی ترپەداری بە خۆیەوە بگرێت. |
| rhythmics | علم الايقاع | **زانستی ترپە :** ئەو زانستەیە کە دیراسەی سیستەمی ترپە دەکات لە زمانێکدا. |
| rhythmic stress | نبر الايقاعي | **هێزی ترپەدار:** سیستەمێکە لەو هێزانەی کە دەکەونە سەر هەندێ برگە بەپێی یاساکانی عەروز (کێش و قافیە)ی تایبەت بە زمانێك. |

| | | |
|---|---|---|
| rill spirant | احتكاكي راسي | **خشۆکی ستونی (دەنگ):** ئەو دەنگە خشۆکەیە کە زار بە شێوەیەکی ستونی لەگەڵیدا دەکرێتەوەو لەباری ئاسۆیشدا تەنگ دەبێت، وەك دەنگی /س، ز، ش، ژ/ هەروەها بە groove fricative ناودەبرێت کە بەرامبەر بەخشۆکی ئاسۆیی slit spirant دەوەستێت. |
| rising diphthong | تنصائت صاعد | **ڤاوڵی دوولانەی بەرزەوەبوو:** ڤاوڵێکی دوولانەیە هێزەکەی لە کۆتایی یان پێش کۆتاییدا بەرزو بەهێز تر دەبێت و دەنگی نیمچە ڤاوڵیش پێشی دەکەوێت وەکو /y u/ ، بەڵام کە هێزەکەی لە سەرەتادا بەرزبێت و لە کۆتاییدا نزم بێتەوە ئەوا بە ڤاوڵی دوولانەی نزم بوو falling diphthong ناو دەبرێت. وەکو /aw/ لە وشەی (داو) یان /ay/ لە وشەی (چای). ئەگەر هێزەکە بەردەوام بوو بەبێ بەرزبوون و نزم بوونەوە ئەوا بە ڤاوڵی دوولانەی یەك ئاست level diphthong ناو دەبرێت. |
| rising juncture | فاصل صاعد | **هەڵوەستەی بەرزەوەبوو:** فۆنیمێکی ناکەرتی کۆتاییە هێماکەی بەم جۆرەیە /↖/ لە کۆتایی وتەدا دێت و پێش وەستان، هەروەها ئاوازەشی لەگەڵدا بەرز دەبێتەوە ئەمەش لە کۆتایی ئەو پرسیارانەوە دێت کە بەکاری یاریدەدەر دەست پێ دەکەن وەکو: دەتوانی ئەم کارە بکەی ↖ ؟ هەڵوەستەی نزم بووش |

| | | |
|---|---|---|
| | | بەرامبەری دەوەستێت falling juncture. |
| rolled consonant = trill | صامت مكرر | **کۆنسنەنتی دووبارەکراو:**<br>ئەو کۆنسنەنتەیە کە لەکاتی درکاندنیدا پێشەوەی زمان بە خێرایی بەر دانەکانی سەرەوە دەکەوێت وەکو /ر/ لە کوردیدا، یان زمانۆچکە بەر پشتەوەی زمان دەکەوێت. |
| rolled sound | صوت تكراري | **دەنگی دووبارەکراو:**<br>بڕوانە زاراوەی پێشوو. |
| roof of the mouth | سقف الفم (الحنك) | **بنمیچی زار (مەلاشوو):**<br>بنمیچی زار لە چوار بەش پێك دێت و بریتیە لە مانەی خوارەوە:<br>پووکی ددان و مەلاشووی ڕەق و مەلاشووی نەرم و زمانۆچکە، هەروەها بە مەلاشوو palate ناودەبرێت. مەلاشوو وەکو سازگەی درکاندن بەشداری لە پرۆسەی درکاندن دەکات کاتێ کە دەنگی پوکی و مەلاشوویی ڕەق و مەلاشوویی نەرم و زمانۆچکەیی تێدا دروست دەبێت. |
| root= root of the tongue | جذر اللسان | **ڕەگی زمان:**<br>بەشی کۆتایی زمان دەگرێتەوە کە دەبێتە دیوار بۆ دیوی پێشەوەی گەروو، بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەشداری لە درکاندن ناکات، بەڵام بە ناڕاستەوخۆیی بەشداری دەکات بەتایبەتی لە شێوەو قەبارەی بۆشایی گەروودا دەور دەبینێ. |
| rounded | مدور، مضموم | **خڕبوو:**<br>سیفەتە بۆ ئەو دەنگەی کە لێوخڕبوونی |

| | | |
|---|---|---|
| | | لەگەڵدایـــــە وەك لـــــە دركانـــــدنی /و/ دا ڕوودەدات. |
| **rounded vowel** | **صائت مدور** | **ڤاوڵی خڕبوو:**<br>ئەو ڤاوڵەی کە لێوخڕبوونەوەی لەگەڵدایە، ئەمەش ڤاوڵەکانی پاشەوە دەگرێتەوە وەکو /و، وو، ۆ/ . ڤاوڵی ناخڕبوو **unrounded vowel** بەرامبەری دەوەستێت کە ڤاوڵەکانی پێشەوەو ناوەندی دەگرێتەوە. |
| **rounding** | **تدوير** | **خڕبوون ( خڕ کردن ):**<br>بریتیە لە خڕبوونی لێوەکان بە تایبەتی لە کاتی دركاندنی ڤاوڵەکانی پاشەوە کە هەردوو لێو لە گەڵیدا خڕ دەبێت، هەروەها لەگەڵ دركاندنی نیمچە ڤاوڵی /w/ دا. |

# - S -

| | | |
|---|---|---|
| secondary accent | نبرة ثانوية | **هێزی دووەم ( ناسەرەکی ) :**<br>بڕوانە زاراوەی secondary stress. |
| secondary articulation | نطق ثانوي | **درکاندنی ناسەرەکی :**<br>هەر سیفەتێکی ناسەرەکی کە شێوەی درکاندنی دەنگێکی زمانی نیشان بدات، وەکو درێژبوونی دەنگ و بەرمەلاشوو دانی ڕەق و بەر مەلاشوودانی نەرم و منگنی یان بەرلووت دان. |
| secondary feature | سمة ثانوية | **سیمای ناسەرەکی :**<br>هەر سیمایەکی دەنگی کە بۆ دەنگێکی سەرەکی زیاد بکرێت، وەکو خڕبوونی لێو بەرمەلاشوودانی ڕەق و بەر لووت دان و درێژبوونی دەنگ. |
| secondary phoneme | فونيم ثانوي | **فۆنیمی ناسەرەکی :**<br>١-ئەو فۆنیمەی کە کەمێك گۆکردنی ڕاست کراوە بۆ ئەوەی سێبەری واتایی جیاجیا ببەخشێ.<br>٢-فۆنیمی ناکەرتییە بڕوانە زاراوەی supra- segmental phoneme. |
| secondary stress | نبرة ثانوية | **هێزی دووەم ( ناسەرەکی ):**<br>فۆنیمێکی ناسەرەکییە هێماکەی بەم جۆرەیە/ ^/ لە ڕووی هێزەوە پاش هێزی سەرەکی دێت. بڕوانە هێز stress. |
| segment= isolate | قطع | **کەرت :**<br>بچوکترین یەکەیە لە دەنگ یان ڕێزمان. |

| | | |
|---|---|---|
| segmental analysis | تحليل قطعي | **شيكردنەوەی كەرتی:**<br>بریتیە لە شیكردنەوەی زمان بۆ فۆنیمە كەرتیەكان كە شیكردنەوەی ناكەرتی prosodic analysis بەرامبەری دەوەستێت. |
| segmental phoneme | فونيم قطعي | **فۆنیمی كەرتی:**<br>ئەو كۆنسنەنتەی یان ڤاوڵەی كە بە شێوەی هێڵی بەرەودواوی یەك دێن لە ئاخاوتندا، ئەمەش جیاوازی لەگەڵ فۆنیمی ناكەرتیدا هەیە كە لەكاتی پێویستدا لەگەڵ فۆنیمە كەرتیەكاندا دەردەكەوێت، هەروەها بە فۆنیمی هێڵی linear phoneme ناودەبرێت. |
| segmentals = segmental phonemes | فونيمات قطعية | **فۆنیمە كەرتیەكان:**<br>بریتیە لە كۆنسنەنت و ڤاوڵەكان، بڕوانە زاراوەی پێشوو. |
| segmentation | تقطيع | **كەرت كردن ( دابڕین ) :**<br>شیكردنەوەی ئەو بەشانەی لە زماندا بەیەكەوە بەستراون بۆ دانەی یەك لەدوای یەك وەكو فۆنیمەكان یان گرافیمەكان یان مۆرفیمەكان واتە جیاكردنەوەی كەرتەكان لەو كەرتانەی كە لە دەوروبەریدا هەن. |
| segmentater | جهاز التقطيع | **ئامێری كەرت كردن:**<br>ئەو ئامێرەیە كە یارمەتی شیكردنەوەی دەنگ دەدات بە ڕێگەی كەرت كردنی ئاخاوتنی بەرەو دوای یەك بۆ كەرت كەرتی دەنگی بچووك. |

| | | |
|---|---|---|
| semi - consonant= semi vowel | شبه صامت | **نیمچه کۆنسنەنت:**<br>ئەو دەنگەیە کە وەکو ڤاولْ دەدرکێت و وەکو کۆنسـنەنت دابـەش دەکرێـت، واتـە لـەڕووی دەنگــەوە (درکاندنــەوە) ڤاوڵــەو لــە ڕووی ئەرکــەوە ( فۆنیمیــەوە) کۆنســنەنتە، لەبــەر ئەوە بە نیمچە کۆنسـنەنت یان نیمچـە ڤـاولْ ناودەبرێت لە کوردیدا دوونیمچە کۆنسنەنت هەیــە ئــەویش / ی، و/ ــە هــەروەها بــە خلیسکاو glide ناودەبرێت. |
| semi- occlusive sound | صوت نصف مغلق | **دەنگی نیوە داخراو:**<br>ئەو دەنگەیە کە زار تێیدا لـە دەنگێکـی تـەنگ زیــاتر دەکرێتــەوە، هــەروەها کــەمتر لــە دەنگێکی نیـوە کـراوە دەکرێتـەوە، وەکو/ یْ/ و /ۆ/. |
| semi- plosive= affricate | شبة انفجاري | **نیمچە گیر( وەستاو ):**<br>بڕوانە دەنگی تێکەڵاو affricate. |
| semi vowel= glide | شبه صائت | **نیمچە ڤـاولْ:**<br>بڕوانە زاراوەی semi consonant . |
| sentence phonetics | علم الاصوات الجملي | **فۆنەتیکی ڕستە :**<br>وەك زانســـتێك لـــەو گۆڕانـــە دەنگیانـــە دەکۆڵێتـەوە کـە لـە ئـەنجامی بـەکار هێنـانی وشەکان لەناو ڕستەدا ڕوودەدات. |
| sentence stress | نبرة الجملة | **هێزی ڕستە :**<br>ئــەو هێــزە ســـەرەکییەی کـــە وشـــەیەك لەوشـەکانی ڕسـتە وەری دەگرێـت بـەوەی کـە ڕسـتە بەیەکەیـەکی ئاخـاوتن دادەنرێـتو بـە وەسـتان دەسـت پـێ دەکـاتو بەوەسـتانیش |

| | | |
|---|---|---|
| | | کۆتایی دێت. هێزەکەشی ئاسایی دەکەوێتە سەر وشەی کۆتایی ڕستە یان ئەو وشەیەی کە زیاتر بایەخی پێ دەدرێت، ئەمەش جیاوازی لەگەڵ هێزی وشەدا هەیە کاتێ وشە ئەو هێزە بەتەنیا دور لە ڕستە وەردەگرێت. |
| series | سلسلة | **زنجیرە دەنگ:** ڕیزبوونی ئاسۆیی ئەو دەنگانەی کە لە سیمایەکی تایبەتیدا لەیەك دەچن، وەکو/ پ، ت، ك، س، ف، / کە لە سیمای گپیدا وەك یەکن، هەروەها / ی، ێ، / لە یەك دەچن بەوەی کە بەڤاوڵەکانی پێشەوە دادەنرێن و /ب، پ، و، م/ ئەم دەنگانەش لە سیمای لێویدا لەیەك دەچن. |
| sharp sound | صوت حاد | **دەنگی تیژ:** ئەو دەنگەیە کە لەرەلەرێکی بەرزی هەیە. |
| shortening | تقصير | **کورت کردن:** ١-بریتیە لە کورت کردنی ماوەی درکاندنی دەنگێك ، ئەمەش بەرامبەر بە درێژبوون lengthening دەوەستێت. ٢-کورت کردنەوەی درکاندن: بریتیە لەلابردنی هەندێ لەبەشەکانی وشە لەکاتی درکاندنیدا وەکو I'll کە کورت کراوەی I shall ی ئینگلیزییە. |
| short vowel | صائت قصير | **ڤاوڵی کورت:** بریتیە لە ڤاوڵێکی سادە simple vowel کە جیاوازی لەگەڵ ڤاوڵی درێژو ڤاوڵی |

| | | |
|---|---|---|
| | | لێکدراودا هەیە، لە زمانی کوردیدا شەش ڤاوڵی کورت هەیە کە ئەمان / ی،i ێ، ە ،و ، ۆ/. |
| sibilant | صفري | **فیکەیی ( دەنگ ):**<br>ئەو دەنگەیە کە سیفەتی فیکەیی تێدایە و لە ئەنجامی تەسك بوونی ڕێڕەوی هەناسەو لێك خشانی تەزووی هەناسە بەو ڕێڕەوەدا پەیدا دەبێت وەکو / ز، س،ژ، ش/ هەروەها بە خشۆکی ستوونی groove fricative ناو دەبرێت، هەندێك دەنگە فیکەییەکان دەکەن بەدەنگی سیکەیی hissing sound وەکو /ز، س/و دەنگی شیکەیی hushing sound وەکو /ژ، ش/. |
| sign | رمز | **هێما ( نیشانە ):**<br>هەر نیشانەیەکی نووسین کە هێما بۆ دەنگێك یان وشەیەك بکات. |
| silent letter | حرف غیر ملفوظ | **پیتی گۆنەکراو:**<br>ئەو پیتەیە کە دەنووسرێ بەلاَم گۆناکرێت، لەکوردیدا ئەم دیاردەیە نییە چونکە هەر پیتێك کە دەنووسرێ گۆدەکرێت، بەلاَم لەزمانی ئینگلیزیدا زۆر جار پیتەکە دەنوسرێ بەلاَم گۆناکرێت وەکو /k/ لەوشەی knife دا، لە هەندێ فەرهەنگدا خاڵێك لەژێر پیتەکە دادەنرێت ئەمەش گوزارشت لەو دەکات کە ئەو پیتە نادرکێت. |
| silent stress | نبرة ساکنة | **هێزی وەستاو:**<br>ئەو هێزەی کە دەکەوێتە سەر وەستان پاش |

| | | |
|---|---|---|
| | | ئەوەی کە شوێنی بڕگەیەکی هێزداری لابراو دەگرێتەوە لەکاتی درکاندنی خێرادا. |
| simple nucleus | نواة بسيطة | **ناوکی سادە:**<br>بریتیە لە ناوکی ئەو بڕگەیەی کە لەیەك ڤاوڵی سادە پێك دێت. وەکو /ە/ لەوشەی (دەم)دا. |
| simple stop | انفجاري بسيط | **گیری سادە:**<br>بریتیە لە دەنگێکی گیری کپی ناهائی. |
| simple vowel | صائت بسيط | **ڤاوڵی سادە:**<br>ئەو ڤاوڵەی کە لە دەنگێکی ڤاوڵی کورت پێك دێت، هەروەها بە ڤاوڵی یەك لانە mono phthong ناو دەبرێت، بەرامبەر بە ڤاوڵی لێکدراو دەوەستێت کە لە دوو دەنگ پێك دێت و پێی دەوترێ ڤاوڵی دوو لانە diphthong یان لە سێ دەنگ پێك دێت و بە ڤاوڵی سێ لانە triphthong ناودەبرێت، بڕوانە ڤاوڵی کورت short vowel |
| simple wave | موجة بسيطة | **شەپۆلی سادە:**<br>بریتیە لە شەپۆلێکی دەنگی سادە، واتە شەپۆلێکی لێکدراو نییە. |
| single – bar juncture | فاصل احادي خط | **هەڵوەستەی یەك هێڵی (کاتی):**<br>فۆنیمێکی ناکەرتییە هێماکەی بەم جۆرەیە / I/ یان بەم جۆرە /→/ یە بڕوانە هەڵوەستەی کاتی sustained juncture . |
| single vowel | صائت مفرد | **ڤاوڵی تاك:**<br>بریتیە لە هەمان ڤاوڵی سادە simple vowel. |

| | | |
|---|---|---|
| sinusoidal wave | موجة لولبية | **شه پۆلی لەولەبی:**<br>یەکێکە لەجۆرەکانی شەپۆلی دەنگی. |
| slack vowel | صائت لين | **ڤاوڵی نەرم:**<br>بڕوانە زاراوەی (lax vowel ) |
| slashes | خطان مائلان | **جووتە هێڵی لار:**<br>بریتیە لە دوو هێڵی خواری تەریب / / کە لە نێوانیاندا هێماکانی فۆنیمییان تێدا دەنووسرێت بۆ ئەوەی لە هێماکانی ئەلۆفۆنی و گرافیمی و مۆرفیمی جیابکرێنەوە کە لە نێوان ئەم هێمایانە دا بەم شێوەیە [ ] ، < > ، { } دەنووسرێن. |
| slender consonant | صامت امامي | **کۆنسنەنتی پێشەوە:**<br>ئەو کۆنسنەنتەیە کە ڕاستەوخۆ دەکەوێتە پاڵ ڤاوڵی پێشەوە. |
| slender vowel | صائت امامي | **ڤاوڵی پێشەوە:**<br>بڕوانە زاراوەی front vowel |
| slit fricative | احتكاكي افقي | **خشۆکی ئاسۆیی:**<br>دەنگێکی خشۆکە کاتێ دروست دەبێت کە ڕێڕەوی هەوا لە ناو زاردا لە باری ئاسۆیی فراوان دەبێت و لە باری ستونیش تەنگ دەبێت، وەکو دەنگی / هـ، ڤ، ف، / . دەنگی خشۆکی ئاسۆیش بەرامبەر بەدەنگی خشۆکی ستوونی دەوەستێت وەکو / ز . س، ژ، ش/ |
| slit spirant | انسيابي ( احتكاكي ) افقي | **داخزانی ( خشۆکی ) ئاسۆیی:**<br>بڕوانە زاراوەی پێشوو. |

| | | |
|---|---|---|
| slur | تداخل | **چوونە ناویەك:**<br>أ- چوونە ناویەکی دەنگەکانی زمان لە کاتی درکاندندا.<br>ب- چوونە ناویەکی پیتەکان لە کاتی نووسیندا. |
| small letter | حرف صغیر | **پیتی بچوك:**<br>بەرامبەر بە پیتی گەورە capital letter دەوەستێت، لە نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی پیتی گەورەو بچوك نییە، بەڵام لە ئەلفوبێی لاتینیدا هەیە. |
| soft consonant | صامت مغور | **کۆنسەنەنتی بەرمەڵاشوودراوی ڕەق:**<br>بڕوانە زاراوەی palatalized consonant. |
| softening | تغوير | **بەرمەڵاشوودانی ڕەق:**<br>بڕوانە زاراوەی palatalization. |
| soft palate= velum | حنك لين<br>طبق | **مەڵاشووی نەرم:**<br>بریتیە لە بەشی پشتەوەی بنمیچی زار کە دەبێتە سازگەی هەندێ دەنگی وەك / ك، گ/. |
| soft sign | رمز التغوير | **هێمای بەرمەڵاشوودان:**<br>ئەو هێمایەیە کە لەژێر یان لە سەر هێمای دەنگەکە دەنووسرێت و گوزارشت لە بەرمەڵاشوودانی دەنگەکە دەکات. |
| sonant | صامت مجهور<br><br>نواة المقطع<br>نصف علة | **١. کۆنسەنەنتی گڕ:**<br>بڕوانە voiced consonant.<br>٢. **ناوکی برگە**: بڕوانە nucleus.<br>٣. **نیمچە ڤاوڵ**: بڕوانە semi-vowel |

| | | |
|---|---|---|
| sonograph | مرسام الاصوات | **وێنەگری دەنگەکان:**<br>ئەو ئامێرەیە بۆ وێنەگرتن و شیکردنەوەی دەنگ بەکار دێت، هەروەها بە sound spectrograph یش ناودەبرێت. |
| sonorant | صوت رنان | **دەنگی زرینگاو:**<br>بڕوانە زاراوەی resonant. |
| Sonority = sonorousness | جهورية | **ڕوونی بەرزی دەنگ:**<br>ئەو هێزەیە کە دەبێتە هۆی ڕوونی بیستنی دەنگ، ئەمەش هۆکارەکانی وەك بەرزی یان درێژی دەنگەکە کار دەکەنە سەری، ئاشکرایە کە ڤاوڵەکان ڕوونی وبەرزیان زیاترە (جهوری ترن) لە کۆنسنەنتەکان، هەروەها کۆنسنەنتە درێژە پێدراوەکان ڕوون و بەرزترن لە کۆنسنەنتە گیرەکان. |
| sound = phone | صوت | **دەنگ:**<br>دەنگێکی زمانی ڕاستەقینەیە لەسەر شێوەی ئەلۆفۆن دەردەکەوێت بڕوانە ئەلۆفۆن allophone. |
| sound change | تغير صوتي | **گۆڕانی دەنگی:**<br>بریتیە لە گۆڕانی دەنگێك بۆ دەنگێکی تر پاش تێپەڕبوونی ماوەیەکی زۆر، وەکو گۆڕانی /ل/ بۆ /ر/ لە هەندێ وشە لەشێوە زاری هەولێردا. |
| sound characteristics | مزايا الصوت | **سیماکانی دەنگ:**<br>ئەو سیمایانەی کە دەنگ بەخۆیەوە دەگرێت وەك: ئاوازە pitch و گڕبوون loudness و جۆری دەنگ timbre. |

| | | |
|---|---|---|
| sound discrimination | تمييز الاصوات | **جياكردنەوەی دەنگەكان:** جياكردنـــەوەی (جيـــاوازی) دەنگێـــك لـــە دەنگێكـی تـر كـاتێ كـە هـەردوو دەنگەكـە بـەجيا يـان لـە چوارچـێوەی ئاخاوتنـــدا گوێمان لێ دەبێت. |
| sound distribution | توزيع الصوت | **دابەش بوونی دەنگ:** بريتيە لە و ژينگە دەنگيانەی كە دەنگێكی زمـــانی تێـــدا دەردەكـــەوێت بـــە تايبـــەتی لەســـنوری وشـــەو ڕســـتەكانی زمانـــدا، بـــۆ نموونـــە هەنـــدێ دەنـــگ لـــە هەنـــدێ زمانـــدا لەســـەرەتای وشـــەدا دەرناكـــەوێت وەك /ڵ/ قەڵەو /ڕ/ سووك لە زمانی كورديدا هەندێكی تـــر لـــە ناوەڕاســـت يـــان لـــە كۆتـــايی وشـــە دەرناكـــەوێت وەكـــو / ە/ لـــە كورديـــدا لـــە كۆتاييدا نايەت. |
| sound law | قانون صوتي | **ياسای دەنگی:** ئـــەو ياســـايەی كـــە سروشـــتی گـــۆڕانی دەنگـــەكانی زمانێـــك ڕوون دەكاتـــەوە بـــە تێپـــەڕبوونی قۆناغـــەكانی مێـــژوويی و لـــە ئـــەنجامی كـــارتێكردنی هۆكـــاری دەرەكـــی و نـــاوەوە ڕوودەدات، وەكـــو ياســـای گـــريم Grimm's law. |
| sound production | احداث الصوت | **دروست بوونی دەنگ:** بريتيـــە لـــە دركانـــدن و بەرهـــەمهێنانی دەنگەكانی زمان. |
| sound reception | استقبال الصوت | **پێشوازی كردنی دەنگ:** بريتيـــە لـــە وەرگـــرتنی دەنگـــەكانی زمـــان و |

| | | |
|---|---|---|
| | | پێشوازی کردنیان وەك سەرتایەك کاتێ کە گوێگر هەست بەو دەنگانە دەکات. |
| sound segment | قطع صوتي | **کەرتە دەنگ:**<br>بچووکترین یەکەی دەنگییە لە زماندا کە لە شێوەی فۆنیمی کەرتی segmental phoneme خۆی نیشان دەدات: |
| sound sequence | متتالية صوتية | **بەدوایەکهاتنی دەنگ:**<br>بریتیە لە کۆمەڵە دەنگێکی زمانی کە بەرەو دوای یەك دەردەکەون، ئەمەش لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر جیاوازی هەیە، ڕەنگە لە زمانێکدا ڕێگە بدرێت بە کۆمەڵە دەنگێك کە لە پاش یەکتر دەربکەون و لە زمانێکی تر دا ڕێگەی پێ نەدرێت. |
| sound source | مصدر الصوت | **سەرچاوەی دەنگ:**<br>أ- بریتیە لە شوێنی دروست بوونی دەنگی زمانی لە ڕێڕەوی دەنگیدا.<br>ب- ئەو ئامێرە دەست کردەی کە دەنگ دەردەهێنێ. |
| sound spectrogram | رسم الصوت | **وێنەی دەنگ:**<br>ئەو وێنەیەی کە ئامێرێکی تایبەت بەناوی وێنەگری دەنگ وێنەکەی دەکێشێ کە لەرەلەرەکانی دەنگی بەشێوەی هێڵێکی ڕەشی ئاسۆیی تێدا دەردەکەوێت، دەکرێ بەهۆی ئەو وێنەیەوە دیراسەی کارتێکردنی دەنگەکە بکەین بەسەر دەنگەکانی دەوروبەریدا، هەروەها ئەو کاریگەریانەش بدۆزینەوە کە گوێی ئاسایی هەستیان پێ ناکات. |

| | | |
|---|---|---|
| sound spectrograph | مرسام الصوت | **وێنەگری دەنگ:**<br>ئـامێرێکی کارەبایيـە وێنــەی شــەپۆلەکانی دەنــگو تايبەتيــەکانی دەکێشــێ لــە ڕووی تونــدیو فراوانـــیو مـــاوەو لەرەلـــەرکانی دەنگەوە. |
| sound structure | تركيب صوتي | **ڕۆنانی دەنگی:**<br>بريتيـە لـە هـەر ڕۆنـانێکی زمـانی کـە وەکـو ڕووداوێکی دەنگی تەماشابکرێت. |
| sound system | نظام صوتي | **سيستەمی دەنگی:**<br>ئەوسيســـتەمەيە کـــە دەنگـــەکانی زمانێـــك نيشـان دەدات، هـەروەها ئـەو پەيوەندييانـەی کــە لــە نێــوان دەنگــەکانو دابــەش بــوونو کۆبوونەوەی هێشووە دەنگ بەدەردەخات. |
| sound type | نوع الصوت | **جۆری دەنگ:**<br>واتە جۆری ئەو دەنگە زمانييە نيشـان دەدات ســەبارەت بــەوەی کــە دەنگێکــی گــيرە يــان تێکەڵاوە يان خشۆکە يان لاييە يان لووتييە يان نيمچە ڤاوڵە يان ڤاوڵە. |
| sound wave | موجة صوتية | **شە پۆلی دەنگ:**<br>يەکێکــە لــەو شــەپۆلانەی کــە دەنــگ لــە قســـەکەرەوە دەگوێزێتـــەوە بـــۆ گـــوێگر، لێکۆڵينــەوەی ئــەو شــەپۆلانەش دەکەوێتــە سنوری فۆنەتيکی فيزيکييەوە. |
| speech habit | عادة كلامية | **نەريتی ئاخاوتن:**<br>بريتيە لەو نەريتە ئاخاوتنەی کە تايبەتـە بـە کەســێك، واتـــە پەيوەنـــدی بـــە شـــێوازی قســەکردنی ئــەو کەسـە هەيـە، يـان شـێوەی |

| | | |
|---|---|---|
| | | درکانـدنی هەنـدیّ لـە دەنگـەکانی زمـان لای ئەوکەسە. |
| speech mechanism | جهاز النطق | **کۆئەندامی ئاخاوتن ( درکاندن ):**<br>ئـەو کۆئەندامەیـە کـە بۆشـایی سـییەکان و بۆشایی گەروو زار و لووت و ئەندامانی تری وەك گــەروو دەنگــە ژێیــەکان و زمــان و لێوەکان و دان و پوکی دان و مەلاشووی نەرم و مەلاشووی ڕەق و زمانۆچکە دەگرێتەوە. |
| speech organ | عضو النطق | **ئەندامی ئاخاوتن ( درکاندن ):**<br>ئـەو ئەندامـەی کـە بەشـداری لـە درکانـدنی دنگــەکانی زمــان دەکــات، بەشــێك لــە ئەندامــەکان جولێنــەرن و پێیــان دەوترێــت درکێنــەر وەکــو زمــان و لێــوی خــواروو، بەشێکی تریان چەسپاون و پێیان دەوترێت سـازگە یـان شـوێنی درکانـدن وەکـو پـوکی دان و مەلاشـووی ڕەق و مەلاشـووی نـەرم. لـە درکانـدنی هــەر دەنگێکـی کۆنسـنەنتدا دوو ئەنـدام لــەو ئەندامانــە بەشــداری دەکــەن، یـەکێکیان خـوارووە کـە درکێنـەرە، ئـەوی تریان سەرووە کە سازگەی درکاندنە. |
| speech pathology | علم عيوب النطق | **زانستی خەوشەکانی ئاخاوتن:**<br>ئـەو زانسـتەیە کـە دیراسـەی هۆکارەکـانی پەیدابوونی یـان سـەرهەڵدانی کـەم کـوڕی و خەوشـەکانی درکانـدن دەکـات، هـەروەها لـە چارەســـــەرکردنی ئــــەو خەوشـــانە دەکۆڵێتەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| speech perception | ادراك الكلام | **هەست كردن بە ئاخاوتن:**<br>بريتيە لە پێشوازى كردن و هەست پێكردنى گوێگر بە وتەكانى ئاخاوتن، ئەم پرۆسەيەش فۆنەتيكى بيستن لێى دەكۆڵێتەوە. |
| speech sound | صوت كلامي (لغوي) | **دەنگە زمانى:**<br>بريتيە لە دەربڕينى ڕاستەقينەى فۆنيم، بڕوانە allophone . |
| speech stretcher | جهاز تبطيء الكلام | **ئامێرى كەم كردنى خێرايى ئاخاوتن:**<br>ئەو ئامێرەيە كە لە تاقيگەى دەنگدا بەكاردێت، لێكۆڵەر دەتوانێ گوێ لە ئاخاوتنى تۆماركراو بگرێت و خێرايى ئاخاوتنەكەش كەم بكاتەوە بێ ئەوەى ئاوازەكەى بگۆڕێت. بەم كارەش بوارێكى چاكتر بۆ لێكۆڵەر دەرەخسێت لە گوێگرتن و شيكردنەوەو بەراورد كردنى دەنگەكاندا. |
| speech tract | ممر الكلام | **ڕێڕەوى ئاخاوتن:**<br>ئەو ڕێڕەوەيە كە تەزووى هەناسە بە ناويدا تێدەپەڕێت لە كاتى ئاخاوتندا، ئەم ڕێڕەوەش هەموو ئەندامانى ئاخاوتن دەگرێتەوە. |
| spelling | تهجئة | **جينجەكردن:**<br>بريتيە لەشێوەى (فۆرمى) وشە كە لە نووسينى ئاساييدا وەرى دەگرێت. |
| spelling pronunciation | لفظ كتابي | **گۆكردنى نووسراو:**<br>بريتيە لە گۆكردنى وشە بە گوێرەى شێوەى نووسراوى ئاسايى وشەكە. لە هەندێ زماندا |

| | | |
|---|---|---|
| | | پیتەکان لەگەڵ دەنگەکانیدا بە تەواوی هاوتانابن، ئەمەش دەبێتە هۆی هەڵەی گۆ کردن لە هەندێ وشەدا. |
| spirant | انسیابي | **داخزانی دەنگ:**<br>ئەمەش دوو جۆرە دەنگ دەگرێتەوە:<br>١-خشۆکی fricative.<br>٢-بەردەوامی continuant. |
| spirantization | انسيابية | **داخزان کردنی دەنگ:**<br>هەر دەنگێك بکرێت بە دەنگێکی داخزاو. |
| split | انشطار | **لەت بوون:**<br>دابەش بوونی فۆنیم بۆ دوو فۆنیم لەو ماوەیەی کە کردەی گەشەکردن و پەرەسەندنی مێژوویی لە زمانێکدا ڕوودەدات. |
| spoonerism | تبادل الاصوات | **جێگۆڕکێی دەنگەکان:**<br>بریتیە لە جێگۆڕکێی دەنگەکان یان بڕگەکان بە هەڵە یان بە ئەنقەست، وەکو تەزرە، تەرزە، مەکتەب، مەتکەب |
| spread vowel | صائت منتشر | **ڤاوڵی بڵاو ( پەرت ):**<br>بڕوانە ڤاوڵی خڕنەبوو unrounded vowel |
| static consonant | صامت امتدادي | **کۆنسنەنتی بەردەوامی:**<br>بریتیە لە دەنگە خشۆکەکان و لاییەکان و لووتیەکان و ونیمچە کۆنسنەنتەکان واتە کۆنسنەنتی گیریان تێکەڵاو ناگرێتەوە، بڕوانە بەردەوامی continuant. ئەمەش بەرامبەر بە کۆنسنەنتی بزوێنەر kinetic consonant دەوەستێت. |

| | | |
|---|---|---|
| steno-sonograph | كاتبة الاصوات | **تۆمارکەری دەنگەکان:**<br>ئەو ئامێرەیە کە دەنگەکانی زمان دەگۆڕێت بە وشەی نووسراو، بۆ ئەم مەبەستەش پیتی تایبەت بەکاردەهێنرێت. |
| stop= plosive | انفجاري ، وقفي | **گیر، وەستاو (دەنگ):**<br>ئەو دەنگەیە کە بەهۆی گیربوون (ڕێگرتن)و پاشان بەرەڵاکردنی تەزووی هەناسەوە دەدرکێت، ئەگەر ڕێگرتنەکە بە هۆی هەردوو لێوەوە بێت، ئەوا دەنگەکە دەبێتە دەنگێکی لێوی گیر وەکو /ب/، /پ/، ئەگەر ڕێگرتنەکە لە پووکی ددان بوو، ئەوا دەبێتە دەنگێکی پووکی گیر وەکو/ ت/ ، / د/، ئەگەر گیربوونەکە لە مەڵاشوودا بوو، ئەوا دەبێتە دەنگێکی مەڵاشوویی گیر وەکو /ك/، / گ/، ئەگەر گیربوونەکە لە گەرووودا بوو ئەوا دەبێتە دەنگێکی گەروویی گیر وەکو /ق/ یان گیربوونەکە لە قوڕگدا دەبێت و دەنگەکەش دەبێتە دەنگێکی قوڕگی گیر وەکو / ئـ- هەمزە/، هەندێ جار پاش گیربوونی دەنگەکە خشانێك ڕوودەدات و لەگەڵیدا تێکەڵ دەبێت ئەوە دەنگێکی نیمچە گیری تێکەڵاو پەیدا دەبێت وەکو/ج/، /چ/. |
| stress | نبرة | **هێز (ستریس):**<br>هێزێکی گۆکردنی ڕێژەییە، دەخرێتە سەر ڤاوڵی هەر برگەیەك لە برگەکانی وشە یان ڕستە، هەروەها پلەی هێزیش کاردەکاتە سەر درێژیو بەرزی دەنگە ڤاوڵەکە، لەگەڵ |

| | | |
|---|---|---|
| | | ئەوەشدا ڕێژەیەکی ڕاستەوانە (طردي) لە نێوان پلەی هێزەکە لەلایەکەوەو درێژیو بەرزی دەنگەڤاوڵەکە لە لایەکی ترەوە هەیە. هێزیش فۆنیمێکی ناکەرتییە چەند جۆرێکی هەیە وەکو هێزی وشەو هێزی ڕستەو هێزی بەرامبەری. |
| stress accent | نبرة تقابلية | **هێزی بەرامبەری:** ئەو هێزە سەرکییە کە دەخرێتە سەر وشەیەك لەوشەکانی رستە بەمەبەستی دووپات کردنەوەو جەخت کردن لەسەر ئەو وشەیە، هەروەها بە contrastive stress ناو دەبرێت. |
| stress contrast | تقابل النبرات | **بەرامبەربوونی هێزەکان:** بریتیە لە بەرامبەربوونی دوو هێز لە دوو شوێنی وەك یەك لە دوو وشەدا کە هەمان فۆنیمە کەرتیەکانی تێدابێت لەگەڵ پەیدابوونی جیاوازی لەواتای وشەکاندا، وەکو: دەَ زوو دە زوَو ، کەَ رە: کەرەَ، ئەم جۆرە بەرامبەربوونەش بەڵگەیە بۆ سەلماندنی فۆنیمییەتی هێز. |
| stressed | منبور | **بەهێزبوو:**<br>١-سیفەتە بۆ برگەی یەکێك لە هێزە سەرکییەکانی وشەیەك.<br>٢-سیفەتە بۆ وشەیەك کە هێزی سەرەکی وەردەگرێت و بەرامبەر بە برگەی وشەکانی تری ڕستە دەوەستێت. |

| | | |
|---|---|---|
| stressed syllable | مقطع منبور | **برگەی بەهێزبوو:**<br>برگەیەك لەوشەیەكدا هێزی سەرەكی وەربگرێت وەكو برگەی یەكەم لەوشەی (مەَ ڕۆ). |
| stressed vowel | صائت منبور | **ڤاوڵی بەهێزبوو:**<br>ئەو ڤاوڵەی كە هێزی سەرەكی وەدەگرێت لەوشەیەكدا یان ڕستەیەكدا بەو سیفەتی كە ناوكی برگەیەكی بەهێزبووە |
| stress mark | رمز النبرة | **نیشانەی هێز:**<br>بریتیە لە نیشانەی فۆنیمی هێز، نیشانەكانیش بەپێی جۆری هێزەكە دەگۆڕێت بەم شێوەیە ئاماژەیان بۆ دەكرێت كە ئەمانەن /↗/ بۆ هێزی سەرەكی و / ^ / بۆ هێزی دووەم و / ↘ / بۆ هێزی سێیەم و/ ˘ / بۆ هێزی لاواز. |
| stress- timed rythem | ايقاع نبري | **ترپەی هێزدار:**<br>ئەو ترپەیەی كە كاتەكەی تێدا یەكسان دەبێت لەنێوان ئەو دوو هێزە سەرەكییەی كە یەك لەدوایەكی وتەیەكدا دەردەكەون، وەكو ترپەی زمانی كوردی‌و ترپەی زمانی عەرەبی یان ئینگلیزی ئەمەش بەرامبەر بە ترپەی برگەیی دەوەستێت. |
| stricture | تضيق | **تەسك بوون:**<br>تەسك بوونی یان كەم كردنەوەی فراوانی ڕێڕەوی تەزووی هەناسە لەكاتی دركاندنی هەندێ لە دەنگەكانی زمان هەروەكو لەدركاندنی دەنگە بەردەوامییەكاندا |

| | | |
|---|---|---|
| | | ڕوودەدات، تەسک بوونـەوەش جیاوازی لەگەڵ داخستنی تەواودا هەیە کە لە دەنگە گیرەکاندا ڕوودەدات. |
| strident | خشن | **زبر، ( خشەدار ):** سیفەتە بۆ ئەو دەنگەی کە خشەخشی تێدایە هەروەها شەپۆلەکانی شێوەیەکی ناڕێک و نالەباریان هەیە، وەکو دەنگە لێوددانیەکان، ئەمەش بەرامبەر بە سیفەتی نەرمی mellow دەوەستێت کە شەپۆلێکی ڕێک و پێکی هەیە، وەکو دەنگە لێوییەکان. |
| strong stress | نبرة قوية ( رئيسية ) | **سترێسی بەهێز( سەرەکی ):** بڕوانە زاراوەی هێزی سەرەکی primary stress. |
| strong vowel= tense vowel | صائت متوتر | **ڤاوڵی گرژمووبوو:** ئەو ڤاوڵەی کە بە گرژبوونی ماسولکەکانی زمان دەدرکێت، وەکو /یی–iy/ لە وشەی (نییە)دا. |
| suction stop | انفجاري جاذب ( امتصاصي ) | **گیری ڕاکێشراو ( هەڵمژین ):** ئەو دەنگە گیرەیە کە پاش درکاندنی پاڵ بە هەواوە دەنێت بۆ ناوەوە، واتە هەڵمژینی هەواکە بەرەو سییەکان، هەروەها بە ingressive stop ناو دەبرێت و بەرامبەر بە گیری دەرهاتوو egressive stop دەوەستێت. |
| superstructure | تركيب علوي ( فوقطعي ) | **ڕۆنانی سەروو( ناکەرتی ):** ئەو فۆنیمە ناکەرتییانەی کە لەگەڵ وشە یان ڕستەدا بەکاردێن وەکو هێزو ئاوازەو هەڵوەستە، کە ڕۆنانی ژێرەوە (کەرتی) |

| | | |
|---|---|---|
| | | infrastructure بەرامبەری دەوەستێت. |
| supradental | لثوي، فوق اسناني | **پووکی، سەرووی دانەکان:**<br>بڕوانە زاراوەی پووکی alveolar . |
| supraglottal cavity | تجويف فوق حنجري | **بۆشایی سەرووی قوڕگ:**<br>هەر بۆشاییەك كە بكەوێتە سەرووی قوڕگەوە، ئەوەش بۆشاییەكانی گەروو، ناو زارو ناو لووت دەگرێتەوە. |
| Supra- segmental grapheme | غرافيم فوقطعي | **گرافیمی ناكەرتی:**<br>ئەو نیشانانەی كە بۆ نووسینی فۆنیمە ناكەرتییەكان بەكاردێن، وەكو نیشانەی هێزو ئاوازەو هەڵوەستە هەروەها بە prosodic mark ناو دەبرێت. |
| surpa -segmental morpheme | مورفيم فوقطعي | **مۆرفیمی ناكەرتی:**<br>ئەو مۆرفیمەیە كە فۆنیمە ناكەرتییەكان پێكی دەهێنن، ئەوەش یان هێزییەو لە كۆمەڵە هێزێك پێك دێت، یان ئاوازەییە كە لە چەند ئاوازەیەك و هەڵوەستەیەك یان زیاتر پێك دێت، وەكو /↘ 231/. |
| surpa segmental phoneme | فونيم فوقطعي | **فۆنیمی ناكەرتی:**<br>ئەو فۆنیمەی كە لەگەڵ فۆنیمی كەرتیدا دەردەكەوێت، ئەوەش یان هێزە یان هەڵوەستەیە یان ئاوازەیە، هەروەها بە فۆنیمێكی لاوەكی یان دووەم secondary phoneme دادەنرێت،و بەرامبەر بە فۆنیمی كەرتی segmental phoneme دەوەستێت كە كۆنسنەنت و ڤاوڵەكان دەگرێتەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| suspicious pair | ثنائي مشبوه | **جووته دەنگی گومان لێکراو:** بریتیه له دوو دەنگی لێکچوو که له شێوەی درکاندنیان یان له سازگەی درکاندنیان وەکو یەکن، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی که له کاتی شیکردنەوەی فۆنیمەکانی زمانێکدا گومانیان لیٚ بکرێت و به دوو ئەلۆفۆنی یەك فۆنیم دابنرێن، ئەم گومان کردنەش دەبێتە بنەمایەك بۆ ئەو گریمانەی که هەردوو دەنگەکە له چوارچێوەی یەك فۆنیمدا دابنرێن، پاشان لێکۆلینەوەکە ئاراسته بکرێت بەرەو تاقیکرنەوەی گریمانەکەو پەسەندکردنی یان ڕەتکردنەوەی به پێی ئەو زانیارییانەی که کۆکراونەتەوە. |
| sustained juncture | فاصل مؤقت | **هەلوەستەی کاتی:** هەلوەستەیەکی دەرەکییە، گۆڕانی پلەی ئاوازەی لەگەلدا نییە. فۆنیمێکی ناکەرتییەو هێماکەی بەم جۆرەیە/ ⟵ / یان /⟶ / واته بەپێی ئاراستەی نووسینی دەنگییە له ڕاستەوە بۆ چەپ یان له چەپەوە بۆ ڕاست، نموونەی ئەمەش ئەو هەلوەستەیەی که دەکەوێتە نێوان گرێی ناوی و گرێی کاری له ڕستەدا. |
| syllabary | ابجدية مقطعية | **ئەلفوبێی بڕگەیی:** ئەو کۆمەلە گرافیمەیە که هەر یەکەیان بڕگەیەك دەنوێنیٚ و له نووسینی بڕگەیشدا بەکاردێت، هەر وەکو له نووسینی زمانی یابانیدا بەرچاو دەکەوێت. |

| | | |
|---|---|---|
| syllabation | تقطيع | **بڕگەکردن:**<br>بریتیە لەکەرت کردن و دابەش کردنی وشە یان ڕستە بۆ ئەو بڕگانەی کە پێکی دەهێنن. |
| syllabic | نواة المقطع<br><br>مقطعي | بۆ دوو مەبەست بەکاردێت:<br>**١-ناوکی بڕگە:** ئەو ڤاوڵەی کە بەرزترین پلەی ڕوونی وەردەگرێت لە بڕگەدا.<br>**٢-بڕگەیی:** ئەوەی کە پەیوەندی بە بڕگەوە هەیە. |
| syllabic consonant | صامت مقطعي | **کۆنسنەنتی بڕگەیی:**<br>ئەو کۆنسنەنتەی کە دەبێتە ناوگی بڕگە، وەکو /n/ لە بڕگەی دووەمی وشەی button. ئەمەش بەپێچەوانەی ئەوەی کە هەیە ڕوودەدات چونکە هەمیشە ڤاوڵ دەبێتە ناوکی بڕگە. |
| syllabic peak | قمة (نواة) المقطع | **لوتکەی (ناوکی) بڕگە:**<br>ئەو دەنگەی کە هێز وەردەگرێت لە بڕگەکەیدا، ئەمەش ئاسایی دەنگی ڤاوڵ دەبێت، بڕوانە ناوکی بڕگە syllabic . |
| syllabic sign | رمز مقطعي | **هێمای بڕگەیی:**<br>نیشانەیەکی نووسینە، گوزارشت لە بڕگەیەکی تەواو دەکات. وەکو لەنووسینی بڕگەییدا بەرچاو دەکەوێت. |
| syllabic stress | نبرة مقطعية | **هێزی بڕگە:**<br>ئەو هێزەی کە ناوکی بڕگە وەری دەگرێت. |
| syllabic writing | كتابة مقطعية | **نووسینی بڕگەیی:**<br>ئەو جۆرە نووسینەیە کە تێیدا هەر |

| | | |
|---|---|---|
| | | هێمایەکی نووسین گوزارشت لە بڕگەیەك دەکات، نەك گوزارشت لەبیرێك یان وشەیەك یان فۆنیمێك بکات، وەکو ئەو نووسینەی کە لە زمانی یابانی و نووسینی مسمارییدا هەیەو بەرچاو دەکەوێت. |
| syllable | مقطع | **بڕگە:** یەکەیەکی دەنگییە بەلای کەمەوە لە ڤاوڵێك پێك دێت ئەویش ناوکی بڕگەکەیە سەرەڕای ئەوەی کە کۆنسنەنتێك یان زیاتری تێدایە کە لەپێش ڤاوڵەکە یان لەپاشی یان لە پێش و پاشی دا دەردەکەوێت وەکو: با، سەر، چاو، ناوکی هەر بڕگەیەکیش پلەیەکی گونجاو لە هێز وەردەگرێت، دەشێ بڕگەش لەوشەیەك پێك بێت وەکو: دەم، لێو، یان بەشێك بێت لەوشە وەکو (پەن) لەوشەی پەنجەرە، هەروەها بڕگە دوو جۆری هەیە، بڕگەی کراوە کە بەڤاوڵ تەواو دەبێت وەکو (دۆ)، لەگەڵ بڕگەی داخراو کە بە کۆنسنەنت تەواو دەبێت وەکو (ڕۆژ). |
| syllable division | تقسيم مقطعي | **دابەشکردنی بڕگەیی:** دابەش کردنی وشە بۆ بڕگەکانی، ئەمەش لەهەندێ فەرهەنگدا پەیڕەو دەکرێت. |
| syllable-timed rhythem | ايقاع مقطعي | **ترپەی بڕگەیی:** ئەو ترپەیەی کە کاتی تێدا یەکسان دەبێت لەنێوان هەربڕگەیەك و ئەو بڕگەیەی کە لەدوایەوە دێت. |

| | | |
|---|---|---|
| symbol | رمز | **هێما ( نیشانە ) :**<br>بۆ ئەم مەبەستانە بەکاردێت:<br>١-گرافیم (پیت) وەکو هێمایەك بۆ فۆنیم.<br>٢-وشە وەکو هێمایەك بۆ ئەو واتایەی کە گوزارشتی لێ دەکات.<br>٣-ڕستە وەکو هێمایەك بۆ بیر. |
| synaloepha | ترخیم | **لابردن ( فڕێدان ) :**<br>بریتیە لەلابردنی دەنگێك یان پیتێك یان برگەیەك لە وشەیەکدا. |
| synchronic phonemics | علم الفونیمات الوصفي | **زانستی وەسفی فۆنیمەکان ( سانکرۆنێکی ) :**<br>ئەو زانستەیە کە وەسفی فۆنیمەکانی زمان دەکات وەکو ئەوەی کە لە سەردەمێکدا هەیەو بەکاردێت بێ ئەوەی لە پەرەسەندن و مێژووی ئەو فۆنیمانە بکۆڵێتەوە. |
| synchronic phonetics | علم الاصوات التزامني | **فۆنەتیکی وەسفی ( سانکرۆنێکی ) :**<br>ئەو زانستەیە کە وەسفی دەنگەکانی زمان دەکات وەك ئەوەی کە لەماوەو سەردەمێکی دیاری کراودا بەکاردێت بێ ئەوەی ئاوڕ لە پەرەسەندنی مێژوویی ئەو دەنگانە بداتەوە، ئەمەش بەرامبەر بە فۆنەتیکی مێژوویی diachronic phonetics دەوەستێت. |
| syncope | ترخیم وسطي | **لابردنی ناوەڕاست :**<br>بریتیە لە لابردنی دەنگێك یان برگەیەك لە ناوەندی وشەیەکدا بە مەبەستی کورت کردنەوە، وەکو گوڵ+ ئاو > گوڵاو |

| | | |
|---|---|---|
| syneresis | ادغام صائتي<br>ترخيم | وەك زاراوەیەك بۆ دوو مەبەست بەكار دێت:<br>١. **لێكدانی ڤـاوڵ:** بریتیە لە تێكەڵ كردنی دوو ڤـاوڵ لـە ڤاوڵێكـدا وەكـو تێكـەڵ بـوونی /ی/ لەگەڵ /ـە/ دا بۆ دروست بـوونی ڤـاوڵی /یْ/ وەكو كانی + ە كە > كانێكە.<br>٢. **لابـــردن:** لابردنـی ڤاوڵێـك لەوشـەیەكدا بەمەبەسـتی كـورت كردنـەوەو ئاسـانی گۆكردن. |
| synizesis | ادغام صائتي | **لێكدانی ڤاوڵ:**<br>بریتیـە لـە تێكـەڵ كردنـی دوو ڤـاوڵ لـە ڤاوڵێكدا. |
| systematic phonetics | علم الاصوات النظامي | **فۆنەتیكی سیستەمی:**<br>هـەروەها بـە فۆنـەتیكی ئـەركی (وەزیفـی) functional phonetics ناو دەبرێت بڕوانە زاراوەی phonemics . |
| systematic transcription | كتابة نظامية | **نووسینی سیستەمی:**<br>**بریتیە لە نووسینی دەنگی یان فۆنیمی كە سیسـتەمی دەنگـی یـان سیسـتەمی فـۆنیمی شـێوەی كۆتـایی وەردەگرێـت و لەزمانێكـدا بـەكار دەهێنرێـت، ئەمـەش بەرامبـەر بـە نووسینی سەرەتایی (انطباعي) دەوەستێت كـە بریتیـە لـەو نووسـینە سـەرەتاییەی كـە شـایەنی دەسـتكاری كردنـەو بـەپێی ئەنجامـەكانی شـیكردنەوەش ڕاسـت دەكرێتەوە.** |

# - T -

| | | |
|---|---|---|
| tap consonant | صامت خفيف | **كونسنەنتی سوك:**<br>ئـەو كۆنسـنەنتەیە كـە دركێنـەرو سـازگەی دركانـدن بـە سـووكیو ماوەیـەكی كـەم لێـك دەكەون لەكاتی دركانـدنی دەنگەكـەدا، وەكـو /ت/ و /د/ لەوشەكانی (تەور، داس) دا. |
| tape recorder | جهاز تسجيل | **ئامێری تۆماركردن:**<br>ئەو ئامێرەیە كە وێنـەو نموونـە زمانییـەكانی لەسەر تۆمار دەكرێتو پاشان ئەو نموونانـە لـــە شـــیكردنەوەی فـــۆنیمیو دەنگـــیو مۆرفیمیدا بەكاردێن، هەروەها ئەو ئامێرە لـە تاقیگـەی فێربـوونی زمـانو لێكۆڵینـەوەی مەیدانی زماندا بەكاردێت. |
| taxonomic phonemics | علم الفؤنيمات التصنيفي | **زانستی پۆلینی فۆنیمەكان:**<br>وەك زانســتێك لـــەزمان دەكۆڵێتـــەوە بـــە مەبەستی شیكردنەوەی فۆنیمی هەر زمانێك، هـــەروەها پـــۆلكردنی فۆنیمـــەكانو ئەلۆفۆنەكانی ئەو زمانە: |
| tense | متوتر | **گرژەوە بوو:**<br>ســیفەتە بــۆ ئــەو دەنگـــەی كــە لـــەكاتی دركاندنیـــدا ماســـولكەكانی ئەنـــدامانی ئاخـاوتن لەگەڵیـدا گرژدەبێتـەوە بەتایبـەتی ماسولكەكانی زمان. |
| tense vowel | صائت متوتر | **ڤاولی گرژەوەبوو:**<br>ئەو ڤاوڵەی كە بە گرژبوونی ماسوولكەكانی زمـان دەدركێـت. وەكـو ڤـاوڵی /ی/ لەوشـەی (كانییەكـە) دا، ئەمـەش بەرامبـەر بـە ڤـاوڵی |

| | | |
|---|---|---|
| | | نەرم lax vowel دەوەستێت. |
| terminal juncture | فاصل ختامي | **هەڵوەستەی کۆتایی:**<br>فۆنیمێکی ناکەرتییە لەکۆتایی وتەدا دەردەکەوێت پێش وەستان، هەروەها گۆڕانی ئاوازەی لەگەڵدا دەبێت، ئەمەش یان هەڵوەستەیەکی بەرەو سەرەوەیە هێماکەی بەم جۆرەیە / ↗ /، یان هەڵوەستەیەکی بەرەو خوارە هێماکەی بەم جۆرەیە / ↘ / بڕوانە هەڵوەستەی بەرەو سەرەوە لەگەڵ هەڵوەستەی بەرەوخوارەوە. |
| terminal letter | حرف ختامي | **پیتی کۆتایی:**<br>ئەو پیتەی کە لەکۆتایی وشەدا دەردەکەوێت. |
| terminal stress | نبرة ختامية | **هێزی کۆتایی:**<br>ئەو هێزەی کە دەکەوێتە سەر بڕگەی کۆتایی وشە. |
| termination | خاتمة | **کۆتایی:**<br>ئەمانەی خوارەوە دەگرێتەوە.<br>١-ئەو پیتەی کە لەکۆتایی وشەدا دەردەکەوێت.<br>٢-ئەو بڕگەیەی کە دەکەوێتە کۆتایی وشە.<br>٣-دەنگی کۆتایی لەوشەدا. |
| ternary | ثلاثي | **سیانی ( سێی ):**<br>سیفەتە بۆ ئەو وشەیەی کە لە سێ بڕگە یان لە سێ مۆرفیم یان سێ پیت یان سێ دەنگ پێک دێت. |

| | | |
|---|---|---|
| tertiary stress | نبرة ثلاثية | **هێزی سێیەم:**<br>ئـەو هێزەیـە کـە لاوازتـرە لـەهێزی دووەمو بـەهێزترە لـەهێزی لاواز، ئەمـەش فـۆنیمێکی ناکەرتییەو هێماکەی بەم جۆرەیـە ‵/ بڕوانـە هێز stress. |
| tetra phthong | صائت رباعي | **ڤاولی چوار لانە:**<br>ئـەو ڤاولـەی کـە لەچـوار ڤـاولی سـادەی لێکـدراو یـان لـە سـێ ڤـاولو نیمچـە ڤاولێـك پێك دێت، ئەمەش جیاوازە لە:<br>ڤاولی یەك لانە monophthong .<br>ڤاولی دوو لانە. diphthong .<br>ڤاولی سێ لانە triphthong . |
| third stress | نبرة ثالثة | **سێیەم هێز:**<br>بڕوانە هێزی سێیەم tertiary stress |
| thought stress | نبرة تقابلية | **هێزی بەرامبەر:**<br>بڕوانە زاراوەی contrastive stress . |
| threshold of hearing | عتبة السمع | **سەرەتای بیستن:**<br>نزمترین لەرەلەری دەنگییە کە مرۆڤ دەتوانێ گوێی لێ بێتو بیبستێ. |
| tighy phonation | نطق ضيق | **درکاندنی تەسك:**<br>ئەو درکاندنەی کە ڕێگە بە بەشێك لەهەناسە (هـەوا) دەدات بـۆ ئـەوەی بەدەنگـە ژێیەکانـدا تێپـەڕێت، ئەمـەش دەبێتـە هـۆی دروسـت بوونی دەنگە گڕەکان. ئەم جۆرە درکاندنەش بەرامبەر بە درکاندنی هەناسەدار breathy phonation دەوەستێت. |

| | | |
|---|---|---|
| tilde= til | تلدة | **تلده:** نیشانەیەکی نووسینە بەم جۆرە ( ~ ) لەسەر پیت دادەنرێت بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی دروست پارمەتی گۆکردنی پیتەکە بدات. گوزارشت کردن لەو نیشانەیەش لەزمانێکەوە بۆ زمانێکی تر جیاوازە. |
| timbre = tambre | نوع الصوت (جرس) | **جۆری دەنگ:** سیفەتە بۆ دەنگێك کە جیایی دەکاتەوە لەدەنگێکی تر تەنانەت ئەگەر بێتو لەبەرزیو ئاوازەشدا لێك بچن. جۆری دەنگیش وەك کارتێکردنێکی بیستن لەئاکامی ژمارەیەك لە شەپۆلی سادە کە شەپۆلێکی لێکدراو پێك دەهێنن پەیدا دەبێتو لەگەڵ لەرەلەرو فراوانی هەر شەپۆلێك دەنگەکە هەڵدەگرێت بەرەو گوێی گوێگر دەیبات. |
| tip of the tongue | راس للسان | **نووکی زمان:** بڕوانە زاراوەی apex. |
| tone color | جرس | **جۆری دەنگ:** بڕوانە زاراوەی timbre. |
| tone language | لغة نغمية | **زمانی ئاوازەدار:** ئەو زمانەیە کە گۆرانی پلەی ئاوازەی لەوشەیەکدا دەبێتە هۆی دروست بوونی جیاوازی لەواتای وشەکە.، هەروەکو لە زمانەکانی چینیو نەرویجیو سویدیو هەندێ لەزمانەکانی هیندی ئەمریکیدا هەیە، هەروەها بەزمانی فرە ئاوازەش polytonic language ناو دەبرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| toneme | تونيم، فونيم نغمي | **تۆنیم، فۆنیمی ئاوازەدار:**<br>ئـەو كۆمەڵــە ئاوازەيـــە كـە لــە زمــانێكی ئاوازەداردا بۆ مەبەستی زمانی بەكاردێت و وەك یەك یەكە تەماشادەكرێت، هەر یەكێك لە ئەنــدامانی ئــەو كۆمەڵــەش بــە ئــەلۆتۆن allotone نــاو دەبرێــت، گـۆڕینی تـۆنیش لـە زمانی ئاوازەداردا دەبێتە هۆی گۆڕانی واتا لەوشەدا. |
| tonetics | علم النغمات | **زانستی ئاوازەكان ( تۆنەتیكس ):**<br>ئـەو زانسـتەیە كـە لــە ئاوازەكــانی دەنــگ دەكۆڵێتەوە. |
| tongue | لسان<br><br><br><br><br><br><br><br><br>لغة | **١-زمان:**<br>ئەنـدامێكی دركانـدنی چالاكە دەجوولێتـەوە بۆ ئەوەی ڕۆڵێكی تەواو ببینێ لە دركاندنی زۆربەی دەنگەكانی زماندا، لـە چەند بەشێك پێــك دێــت وەك نــووكی زمــان و پێشــەوەو ناوەڕاســت و كۆتــایی لەگــەڵ ڕەگــی زمــان هــەروەها لـە ڕاگـرتنی تـەزووی هەناسـە یـان ڕێگــەگرتنی هەناســـە یــان لــە پێكهاتـــەی بۆشایی ناوزاردا بەشداری دەكات.<br>**٢-زمان وەك زاراوە.** |
| tongue advancement | تقديم اللسان | **پێش خستنی زمان:**<br>درێـژكردنـەوەی زمـان بـەرەوپێش لـە كـاتی دركاندنی ڤاوڵێكدا. |
| tongue center | وسط اللسان | **ناوەڕاستی زمان:**<br>ئەو بەشـەیە لـە زمـان كـە دەكەوێتـە نێـوان بەشی پێشەوەو پاشەوەی زمان. |

| | | |
|---|---|---|
| tongue dorsum | مؤخرة اللسان | **پاشەوەی زمان:** ئەو بەشەیە لە زمان کە دەکەوێتە نێوان ناوەڕاستی زمان و ڕەگی زمان ئەمەش بەشداری دەکات لە درکاندنی دەنگەکانی مەلاشووی نەرمدا. وەکو / ك ، گ/ |
| tongue front | مقدم اللسان | **پێشەوەی زمان:** ئەو بەشەی زمانە کە دەکەوێتە نێوان نووکی زمان و ناوەڕاستی زمانەوە بەشداری لە درکاندنی ئەو دەنگانە دەکات کە بەدەنگی مەلاشوویی ڕەق و دەنگی پووکی ناودەبرێن، وەکو/ ن، ژ، ج، چ/ |
| tongue root | جذر اللسان | **ڕەگی زمان:** ئەو بەشەیە کە دەکەوێتە کۆتایی بەشی پاشەوەی زمان. |
| tongue tip= apex | ذلق | **نووکی زمان:** بەشی کۆتایی پێشەوەی زمانە، بەشداری لە درکاندنی دەنگە ناو ددانییەکان دەکات وەکو /ذ، ظ/ ی زمانی عەرەبی، هەروەها بەشداری لە درکاندنی دەنگە پووکییەکانی وەك/ ز، س، د، ت/ دەکات. |
| tonic | منبور | **هێزدار:** ئەو دەنگەی یان برگەیەی کە هێزی سەرەکی وەردەگرێت. |
| total assimilation | مماثلة تامة | **گونجانی تەواو:** بریتیە لە گۆڕانی دەنگێکی زمانی بۆ ئەوەی بە تەواوی لە دەنگێکی تری دراوسێی خۆی بچێت، وەکو گۆڕانی تەواوی /د/ بە /ڎ/ |

| | | |
|---|---|---|
| | | لەوشەی (حەڤدە) لەزاری سلێمانیدا دەبێت بە (حەڤڤە). |
| total dissimilation | مغايرة تامة | **نەگونجانی تەواو:** بریتییە لە گۆڕانی دەنگێك بۆ ئەوەی بەتەواوی لەگەڵ دەنگێکی تری دەوروبەری خۆیدا جیاواز بێت، وەکو گۆڕانی / ش/ بە /ر/ لە وشەی پاش+ سەنگ > پارسەنگ. |
| trachea= wind pipe | القصبة الهوائية | **بۆڕی هەناسە:** یەکەم ڕێڕەوە هەوای تێدا تێ دەپەڕێت پاش دەرچوونی لە سییەکانەوە، قورگیش دەکەوێتە سەرووی ئەو ڕێڕەوە. |
| traditional orthography | تهجينة تقليدية | **ئەلفوبێی (هجائی) کۆن:** بریتییە لە شێوەی نووسینی ئاسایی وشەکانی زمانێك کە پیتەکانی ئەلفوبێی کۆنی تێدا بەکاردێت بێ ئەوەی گوێ بدات بە گۆڕانی دەنگەکان کە لە وشەکانی ئەو زمانەدا ڕوودەدات. |
| transcription | كتابة | **نووسین:** بریتییە لە دەربڕینی زمانی ئاخاوتن بە هێماکانی ئەلۆفۆنی یان فۆنیمی یان ئەلفوبێی. |
| transitional sound | صوت انتقالي | **دەنگی گوازراو (خلیسکاو، نیمچە ڤاوڵ):** بڕوانە زاراوەی glide. |
| tri-consonantal | ثلاثي الصوامت | **سێ کۆنسنەنتی:** سیفەتە بۆ هەر ڕەگێك کەسێ کۆنسنەنتی تێدابێت وەکو وشەی (نارد). |

| | | |
|---|---|---|
| trigraph | حرف ثلاثي | **سێ پیتی :**<br>سێ پیت بەسەر یەکەوە کە گوزارشت لە دەنگێك بکەن. |
| trill | صوت تكراري | **دەنگی دووبارەکراو :**<br>ئەو دەنگەی کە بە خێرایی و دووبارەکراو دەدرکێت، وەکو / ر، ڕ/. ئەو دووبارە کردنەش لە ئەنجامی لەرینەوەی نووکی زمان ڕوودەدات، هەروەها بە rolled sound ناودەبرێت. |
| triphthong | صائت ثلاثي | **ڤاولی سێ لانە :**<br>ڤاولێکی لێکدراوە لە سێ ڤاولی یەك لەدوای یەك، یان لە ڤاولێك و نیمچە ڤاولێك و ڤاولێك پێك دێت لە برگەیەکدا. |
| trisyllable | كلمة ثلاثية المقاطع | **وشەی سێ برگەیی :**<br>ئەو وشەیەی کە لەسێ برگە پێك دێت، وەکو: مێرگەسور، سەرگەڵو. |

# - U -

| | | |
|---|---|---|
| ultralong vowel | صائت مديد | **ڤاوڵی درێژ کراو:**<br>ئـەو ڤاوڵـە درێژەیـە کـە لەپاشـیدا دەنگـی هەمزە یان کۆنسنەنتێك دێت وەکو لەوشـەی (ئـەلفبـاء)دا دەنگـی هـەمزە کەوتۆتـە پـاش دەنگی /ا/ ی درێژ. |
| umlaut | <br>**تغير الصائت**<br><br><br><br><br><br><br>**اشارة التغير**<br><br><br><br>**ازدواج صوتي** | وەك زاراوەیەك بۆ ئەم مەبەستانە بەکاردێت:<br>**١-گۆڕینی ڤاوڵ:**<br>بریتیە لە گۆڕینی شێوەی گۆکردنی ڤاوڵێك لەبـەر هـەر هۆیـەکی نـاوخۆیی بێـت کـە لەخودی وشەکەدا ڕوودەدات، ئەمـەش بـەهۆی کارتێکردنی ڤاوڵێکی تر یان نیمچە ڤاوڵێك یان کۆنسـنەنتێك لـە بڕگەیـەکی دەوروبەریـدا کە گۆکردنی ڤاوڵەکە بگۆڕێت.<br>**٢-نیشانەی گۆڕان:**<br>نیشـانەیەکی بـەم جۆرەیـە [¨] لەسـەر ئـەو ڤاوڵـە دەنووسـرێت کـە شـێوەی گـۆکردنی گۆڕاوە.<br>**٣-جووت بوونی (تێکەڵ بوونی) دەنگی:**<br>جیاکردنـەوەی دوو دەنـگ کـە یـەك دەنگییـان پێکهێنـاوە بـۆ ئـەوەی هەریەکـەیان ببێـت بـە دەنگێکی سەربەخۆ لە هەمان وشەدا، وەك لـە گۆکردنی وشـەی (چاکردن)دا ڕوودەدات کـە وشـەکە لـە بنجـدا لـە دوو / ك/ پێـك هـاتووە (چاککردن). |
| unaspirated | غير هائي،<br>غير نفسي | **ناهائی (بێ پڤە):**<br>سـیفەتە بـۆ ئـەو دەنگـەی کـە هەناسـەیەکی |

| | | |
|---|---|---|
| | | (پفەیەکی) بەهێزی هەوای لەگەڵدا نییە لەو ژینگە دەنگییەی کە تێیدا دەردەکەوێت، وەکو [پ] لەوشەی (سپی)دا، ئاسایی ئەم سیفەتە دەدرێتە دەنگێکی گیری کپ بەتایبەتی کە دەکەوێتە پاش [س] و هائییەکەی نامێنێ. |
| unaspirated position | موقع غير هائي | **شوێنی ناهائی:**<br>بریتیە لەو ژینگە دەنگییەی کە پێویستە سیفەتی هائی لەو دەنگەدا نەمێنێ کاتێ لەو شوێنەدا دەردەکەوێت، بڕوانە بابەتی پێشوو. |
| unconditioned sound change | تغير صوتي غير مشروط | **گۆڕانی دەنگی بێ مەرج:**<br>هەر گۆڕانێکی دەنگی ڕوودات بێ ئەوەی ئەو گۆڕانە پابەندی مەرجەکانی ژینگەی دەنگی دەوروبەربێت. |
| under-differntiated transcription | كتابة قاصرة التمييز | **نووسینی جیاکەرەوەی ناتەواو:**<br>نووسینێکی فۆنیمی سەرەتاییە، لەم نووسینەدا دوو فۆنیم یان زیاتر مامەڵەی ئەوەیان لەگەڵدا دەکرێت کە ئەلۆفۆنی یەك فۆنیم بن و یەك هێماشیان بۆ دادەنرێت. ئەم جۆرە نووسینە زمانەوان لەسەرەتای شیکردنەوەو دەستنیشان کردنی فۆنیمەکانی زمانێکدا بەکار دەهێنێ کە زانیارییەکی تەواوی لە بارەی سیستەمی فۆنیمی و دەنگی ئەو زمانە دا نەبێت. |
| unilateral consonant | صامت احادي الجانب | **کۆنسنەنتی یەك لایی:**<br>ئەو دەنگەیە کە لەگەڵ تێپەڕبوونی تەزووی |

| | | |
|---|---|---|
| | | هەناسە لەلایەکی زارەوە دەدرکێت، وەکو دركاندنی لامی سووك لە وشەی (لانە)دا. |
| unreleased | محبوس | **بەندکراو (گیربوو):**<br>سیفەتە بۆ دەنگێکی گیر کە لە پاش درکاندنی دەنگەکەدا ئەو هەناسەیەی کە گیری خواردووە دەرناپەڕێت، ئەم سیفەتەش هەندێ جار لەدەنگێکی گیری کپدا ڕوودەدات کە دەکەوێتە کۆتایی وشەوە، وەکو /پ/ لەوشەی (تۆپ) دا. جاری وا دەبێت دەنگی گیری کپ لەکۆتایی وشەدا یان گیر دەبێت یان پفەدار (هائی) دەبێت. |
| unrounded vowel | صائت غیر مدور | **ڤاولی خڕنەبوو:**<br>ئەو ڤاوڵەیە کە لەکاتی درکاندنیدا خڕبوونی لێوەکانی لەگەڵدا نییە، وەکو ڤاوڵەکانی پێشەوەو ڤاوڵەکانی ناوەند، ئەمەش بەرامبەر بە ڤاولی خڕبوو دەوەستێت وەکو /و، وو، ۆ/. |
| unrounding | ازالة التدویر | **لابردنی خڕبوون:**<br>لابردنی خڕبوونی لێوەکان لەکاتی درکاندنی ڤاوڵێکی خڕبوو لەبنجدا. |
| unstable phoneme | فونیم متقلب | **فۆنیمی هەڵگەڕاو:**<br>ئەو فۆنیمەیە کە لەسەر بارێکدا جێگیر نابێت و لە زارێکەوە بۆ زارێکی تر دەگۆڕێت وەکو فۆنیمی /ل/ کە بە /ر/ دەدرکێت لە زاری هەولێردا یان گۆڕینی /و/ ی نیمچە ڤاولْ بە /ڤ/ لەکرمانجی ژووروودا وەکو (ئاو) دەبێت بە (ئاڤ). |

| | | |
|---|---|---|
| unstable sound | صوت متقلب | **دەنگی هەڵگەڕاو:**<br>ئەو دەنگەیە کە لە دەوروبەرێکەوە (سیاقێکەوە) بۆ دەوروبەرێکی تر دەگۆڕێت یان لە زارێکەوە بۆ زارێکی تر دەگۆڕێت، بڕوانە زاراوەی پێشوو. |
| unstressed syllable | مقطع غیر منبور | **بڕگەی بێ هێز ( لاواز ):**<br>ئەو بڕگەیەیە کە هێزی سەرەکی لەوشە یان ڕستەدا وەرناگرێت، ئەمەش بەرامبەر بە بڕگەی هێزدار stressed syllable دەوەستێت. |
| unstressed vowel | صائت غیر منبور | **ڤاوڵی بێ هێز:**<br>ئەو ڤاوڵەیە کە هێزی سەرەکی لەوشە یان ڕستە وەرناگرێت، ئەمەش ڤاوڵی بڕگەی (لاوان) بێ هێز دەگرێتەوە. |
| unvoiced | مهمس | **کپ کراو ( بەکپ کردن ):**<br>سیفەتە بۆ ئەو دەنگەی کە گڕی (ژێداری) ئاسایی خۆی بەکردەی کپ بوون لەدەست داوە. ئەمەش جیاوازی لەگەڵ کپ بووندا voiceless هەیە، کە بەرامبەر بە گیربوون voiced دەوەستێت.. |
| unvoicing | اهماس | **کپ بوون:**<br>بریتییە لەگۆڕینی کۆنسەنەنتێکی گڕ بەدەنگێکی کپی هاوشێوەی خۆی لەئەنجامی کارتێکردنی دەنگێکی کپی دەوربەر، وەکو لەدرکاندنی وشەی (ڕۆشتان باش)دا دەردەکەویت کە دەنگی /ژ/ ی گڕ بەهۆی کار تیکردنی /ت/ی کپ گۆڕاوە بە /ش/ی کپ. |

| | | |
|---|---|---|
| unvoweled writing | كتابة غير صائتية | **نووسینی بیٚ ڤاولٚ:** ئەو نووسینەیە کە ڤاولٚە کورتەکانی تیٚدا دەرناکەویٚت، ئەمەش لەنووسینی زمانی عەرەبیدا بەرچاو دەکەویٚت کاتیٚ کە سەروبۆڕی بۆ دانانریٚت لەبەر ئەوە ئەم جۆرە نووسینە تەنیا کۆنسنەنت و ڤاولٚە دریٚژەکانی تیٚدا دەردەکەویٚت. |
| upper articulator | ناطق علوي | **درکیٚنەری سەروو( بەرز):** ئەندامیٚکی درکاندنی چەسپاوە شویٚنی ئەم ئەندامە بەرزترە لەشویٚنی ئەندامانی درکاندنی جولٚیٚنەر. لەڕاستیدا بۆ درکاندنی هەر کۆنسنەتیٚك درکیٚنەریٚکی سەرووی چەسپاوی هەیە. لەگەلٚ درکیٚنەریٚکی جولٚیٚنەری خواروو، نموونە بۆ درکیٚنەری سەروو لیٚوی سەروو دانەکانی سەروو پووکی ددان و مەلاٚشووی ڕەق. نموونەش بۆ درکیٚنەری خواروو لیٚوی خواروو زمان، هەروەها درکیٚنەری سەروو بە شویٚنی درکاندن یان سازگەی درکاندن point of articulation ناودەبریٚت. |
| upper jaw | الفك الاعلى | **چەناگەی سەروو:** ئەندامیٚکی درکاندنە ژمارەیەك ئەندام بە خۆیەوە دەگریٚت کە بەشداری لە درکاندن دەکەن، وەکو لیٚوی سەروو دانەکانی سەروو پووکی ددان و مەلاٚشووی ڕەق و مەلاٚشووی نەرم لەگەلٚ زمانۆچکە. |
| upper lip | الشفة العليا | **لیٚوی سەروو:** سازگەیەکی درکاندنی چەسپاوە بەشداری لە |

| | | |
|---|---|---|
| | | درکاندنی چەند دەنگێکی زمان دەکات وەکو /ب، پ، و،م/. |
| upper teeth | الاسنان العليا | **دانەکانی سەروو:**<br>سازگەیەکی درکاندنی چەسپاوە بەشداری لە درکاندنی چەند دەنگێکی زمان دەکات وەکو دەنگە دانییەکانی / ت/ ، / د/. |
| utterance | قول<br><br><br><br>نطق | بۆ دوو مەبەست بەکاردێت:<br>**١-وتە:**<br>بریتیە لەزنجیرە دەنگێکی زمانی کە واتایەك دەگەیەنێت، بەوەستان دەست پێ دەکات و بەوەستانیش کۆتایی دێت، هەروەها هێزێکی سەرەکیشی لەگەڵدایە.<br>**٢-درکاندن:**<br>وەك کردەیەك بریتیە لە بەرهەمهێنانی یان دروست بوونی دەنگەکانی زمان. |
| utterance act | عملية النطق | **کردەی درکاندن:**<br>ئەو کردەیەیە کە هەڵدەستێت بە دەرهێنانی یان دەرکردنی دەنگەکانی زمان. |
| uvula | لهاة | **زمانۆچکە:**<br>**بەشێکی بچووکی نەرمە لەدیوی پاشەوی مەلاشووی نەرم شۆربۆتەوە، درکێنەرێکی چەسپاوە وەکو مەلاشووی نەرم و مەلاشووی ڕەق.** |
| uvular | لهوي | **زمانۆچکەیی (دەنگ):**<br>ئەو دەنگەیە کە زمانۆچکە بەشداری لەدرکاندنی دەکات، وەکو /ق/ لەوشەی (قوڵ)دا، هەروەها دەبێتە سیفەت بۆ ئەو جۆرە دەنگە. |

# - V -

| | | |
|---|---|---|
| velar | طبقي | **مەلاشوویی نەرم (دەنگ):**<br>ئـەو دەنگەیـە کـە پاشـەوەی زمـان لەگـەڵ درکاندنیـدا نزیـك دەبێتـەوە لـە مەلاشـووی نـەرم، وەکـو دەنگـی /ك،گ/ هـەروەها /نـگ/ لەوشەی (مەنگ)ی زاری سلێمانیدا. ئەمەش دەبێتە سیفەتێك بۆ مەلاشووی نـەرم خـۆی، هـەروەها بـۆ ئـەو دەنگـەی کـە بـەو شـێوەیە دەدرکێت. |
| velar closure | انغلاق فموي طبقي | **داخستنی زاری مەلاشوویی نەرم:**<br>بریتیـە لـە داخسـتنی ڕێـڕەوی زار بـەهۆی زمان و مەلاشووی نەرمەوە، ئەمەش جیاوازی لەگەڵ داخستنی لووتی مەلاشوویدا هەیە. |
| velarization | اطباق، تفخیم | **بەر مەلاشوودانی نەرم:**<br>بریتیـە لەبەرزبوونـەوەی پشـتەوەی زمـان بەرەو مەلاشووی نەرم، ئەمەش وا لەدەنگەکە دەکات کە ببێتە دەنگێکی بەرمەلاشوودانی گەورەکراو. |
| velarized | مطبق | **بەمەلاشووکراوی نەرم:**<br>سیفەتە بۆ ئەو دەنگەی کە بەرمەلاشوودانی نەرمی لەگەڵدایە. |
| velarized consonant | صامت مطبق | **کۆنسنەنتی بەمەلاشووکراوی نەرم:**<br>ئەو دەنگە کۆنسـنەنتەیە کە پشتەوەی زمان لەگەڵیـدا بـەرز دەبێتـەوە بـەرەو مەلاشـووی نـەرم، وەکـو دەنگـی /ڵ/ ی قەڵـەو و /ڕ/ ی قەڵـەو لـەزمانی کوردیـدا، هـەروەها /ص/ و /ط/ و /ظ/ لەزمانی عەرەبیدا. |

| | | |
|---|---|---|
| velar stop | انفجاري طبقي | **گیری مەلاشوویی نەرم:** ئەو دەنگە وەستاوەیە کە مەلاشووی نەرم دەبێتە سازگەی دەنگەکەو پشتەوەی زمانیش دەبێتە درکێنەر بۆ دەنگەکە، وەکو/ك/ و /گ/. |
| velar vowel | صائت طبقي | **قاوڵی مەلاشوویی نەرم:** بڕوانە قاوڵی پشتەوە back vowel. |
| velic closure | انغلاق انفي طبقي | **داخستنی لووتی مەلاشوویی نەرم:** بریتیە لەداخستنی ڕێڕەوی لووت بە ڕێگەی مەلاشووی نەرمەوە، ئەمەش جیاوازی لەگەڵ داخستنی زاری مەلاشوویدا velar closure هەیە. |
| velum= soft palate | طبق ، حنك اللين | **مەلاشووی نەرم (نەرمە مەلاشوو):** ئەندامێکی ماسولکەیی نەرمە دەکەوێتە بنمیچی زارەوە لەنێوان مەلاشووی ڕەق و زمانۆچکە، بە بەشێك لە مەلاشوو دادەنرێت، کاتێ کە بەرەو خوار دەجولێت و نزم دەبێتەوە ئەو ڕێڕەوە دەکرێتەوە کە بەرەو بۆشایی ناو لووت دەچێت، بەڵام کە بۆ سەرەوە بەرزدەبێت ئەو ڕێڕەوە دادەخات، هەروەها لەکاتی لکانی پشتەوەی زمان یان نزیك بوونەوەی لە مەلاشووی نەرم دەبێتە هۆی دروست بوونی دەنگێکی مەلاشوویی نەرم. |
| vocal | صوتي | دوو مەبەست دەگەیەنێت: **١-دەنگی:** ئەوەی پەیوەندی بەدەنگەوە هەیە |

| | | |
|---|---|---|
| | مجهور | **٢-گڕ ( ژێدار ):**<br>بڕوانە زاراوەی voiced. |
| vocal appartus | جهاز النطق | **کۆئەندامی درکاندن:**<br>ئەو ئەندامانەی کە بەشداری دەکەن لە پرۆسەی درکاندنی دەنگەکانی زماندا. |
| vocal – auditory channel | القناة الصوتية السمعية | **کەناڵی دەنگی بیستن:**<br>واتە پەیوەندی کردن بەڕێگەی ئاخاوتنی قسەکەرو گوێگرتنی گوێگر لەوەی کە دەری دەبڕێت. |
| vocal bands | الحبال الصوتية ( الاوتار الصوتية ) | **ژێیەکانی قوڕگ ( تاڵە باریکەکانی قوڕگ ):**<br>بڕوانە زاراوەی vocal cords. |
| vocal characterizer | واصف الصوت | **دەنگ وەسفکەر:**<br>بڕوانە زاراوەی: voice qualifier. |
| vocal cords | الحبال الصوتية | **ژێیەکانی قوڕگ:**<br>بریتیە لەدوو دەستە (شریتی) ماسولکەیی نەرم کە بەرامبەر بەیەك وەستاون. ئەم دوو دەستە ماسولکەیە بە ئێسقانی لوولەی قوڕگەوە بەستراونەتەوە، بەهۆی جوڵانەوەی ئەو ئێسقانەوە، ئەم دوو دەستە ماسولکەیە دەکرێنەوەو دیسان دێنەوە یەك، واتە لەگەڵ جوڵانەوەی ژێیەکانی قوڕگدا چەند بارێکی تایبەتی وەردەگرن و کار دەکەنە سەر دەنگەکانی زمان بەم شێوەیە:<br>أ-کرانەوەی ژێیەکانی قوڕگ و تێپەربوونی هەوا بێ ئەوەی ڕێگەی لێ بگرێ، واتە بێ |

| | | |
|---|---|---|
| | | لەرینەوەی ژێیەکان، ئەو دەنگانەی کە لەم بارەدا دەدرکێن بەدەنگی کپ -voiceless sound- ناودەبرێن.<br>ب-کرانەوەو هاتنەوە یەکی ژێیەکان بە خێرایی و یەك بەدوای یەکدا لەگەڵ تێپەڕبوونی هەوادا کە دەبێتە هۆی لەرینەوەی ژێیەکان، ئەو دەنگەی بەم شێوەیە بدرکێت بە دەنگی گڕ – voiced sound– ناودەبرێت.<br>ت-هاتنەوەیەکی تەواوی ژێیەکان بۆ ماوەیەك و پاشان کرانەوەیان و بەرەڵابوونی هەوا، ئەم بارەش دەبێتە هۆی درکاندنی دەنگی هەمزە– glottal stop–. |
| vocalic | صائتي | **ڤاوڵی:**<br>ئەوەی کە پەیوەندنی بەدەنگی ڤاوڵەوە هەیە. |
| vocalic consonant | صامت صائتي | **کۆنسنەنتی ڤاوڵی:**<br>ئەو کۆنسنەنتەی کە هەندێ جار دەتوانێ بە ئەرکی ڤاوڵ هەڵبستێ وەکو /ل، ر، م، ن/ ڕەنگە هەر دەنگێك لەو دەنگانە ببێت بە ناوکی بڕگەیەکی بێ هێز. |
| vocalic length | طول الصائت | **درێژی ڤاوڵ:**<br>أ- بریتیە لەماوەی درێژبوونی درکاندنی دەنگی ڤاوڵ، واتە ڕادەی کورتی و درێژی درکاندنی ڤاوڵەکان دەگرێتەوە.<br>ب- سیفەتە بۆ ڤاوڵی درێژ، ئەمەش ڕەنگە ببێتە سیمایەکی فۆنیمی یان نا فۆنیمی بۆ |

| | | |
|---|---|---|
| | | دەنگەكە. |
| vocalism | دراسة الصوائت<br>صوائت لغة ما<br>اعلال | وەك زاراوەيەك بۆ ئەم مەبەستانە بەكاردێت:<br>**١-ديراسەكردنى ڤاوڵەكان.**<br>**٢-بريتيە لە ڤاوڵەكانى زمانێك.**<br>**٣-بە ڤاوڵ كردن:**<br>واتە گۆڕينى دەنگى كۆنسنەنت بە ڤاوڵ. |
| vocalization | اعلال<br>اجهار<br>اضافة الحركات<br>نطق، لفظ | **١-بە ڤاوڵ كردن:**<br>بريتيە لە گۆڕينى دەنگى كۆنسنەنت بە ڤاوڵ.<br>**٢-بە گڕكردن:**<br>بڕوانە زاراوەى voicing .<br>**٣-زياد كردنى سەروبۆر:**<br>بريتيە لە زياد كردنى نيشانەى ڤاوڵە كورتەكان بۆ سەر ئەو وشانەى كە دەنووسرێن واتە زياد كردنى سەرو بۆرو ژێر بۆ وشەكان هەر وەكو لەزمانى عەربيدا هەيەو بەكار دێت<br>**٤-دركاندن (گۆكردن):**<br>بڕوانە زاراوەى articulation. |
| vocalized | مجهور | **گڕ (ژێدار):**<br>بڕوانە زاراوەى voiced. |
| vocal system | نظام صوتي | **سيستەمى دەنگى:**<br>ئەو سيستەمەيە كە زمان لە ئاستى دەنگسازيدا پابەندى دەبێت لەبارەى جۆرى دەنگەكانو ژمارەيانو شوێنى |

| | | |
|---|---|---|
| | | دەرکەوتنیان و سیماکانیان و فۆنیمەکان و ئەلۆفۆنەکانیانەوە. هەر زمانێکیش سیستەمێکی دەنگی تایبەتی خۆی هەیە. |
| vocal tract | الممر الصوتي | **ڕێڕەوی دەنگی:**<br>ئەو ڕێڕەوەیە کە لە لەشی مرۆڤدا هەیەو ئەندامانی ئاخاوتنی تێدایە. ڕێڕەوەکە لە سییەکانەوە دەست پێ دەکات و بە سورێنچک و قوڕگ و ژێیەکانی قوڕگ و پاشان بەناو زارو لووتدا تێ دەپەڕێت تا دەگاتە هەردوو لێوی سەرو و خوارەوە. |
| vocoid | صائت | **ڤاوڵ:**<br>زاراوەیەکە تایبەتە بە دەنگسازی، جیاوازی لەگەڵ ڤاوڵدا – vowel– هەیە کە تایبەتە بە زانستی فۆنیمەکان، ئەمەش بەرامبەر بە کۆنسنەنت contoid یان consonant دەوەستێت. |
| voice | صوت الانسان<br>جهر<br><br><br><br>يجهر | **١-دەنگی مرۆڤ:**<br>**٢-گڕی:**<br>بریتیە لە لەرینەوەی ژێیەکانی قوڕگ کاتێ کە ژێیەکان بەرەنگاری تەزووی هەناسە دەبنەوە، ئەم کارەش دەبێتە هۆی گڕبوونی دەنگەکە.<br>**٣-گڕکردن:**<br>ئەوەی کە دەنگی کپ دەکات بە گڕ. |
| voice box | حنجرة | **قوڕگ:**<br>ئەندامێکی ماسولکەیی یە دەکەوێتە سەرووی سورێنچکەوە، ژێیەکانی قوڕگ |

| | | |
|---|---|---|
| | | دەکەوێتە ناو قورگەوە کە کاردەکاتە سەر دەنگو دەیکات بە گڕ یان بە کپ، هەروەها بە larynx یان سێوی ئادەم ناودەبرێت. |
| voiced | مجهور | **گڕ (ژێدار):**<br>سیفەتە بۆ ئەو دەنگەی کە ژێیەکانی قورگی لە گەڵدا دەلەرێتەوە، ئەم لەرینەوەیەش کاتێ هەستی پێ دەکرێت کە قسەکەر پەنجەی لە دیوی دەرەوە بخاتە سەر گەروو، هەروەها بە voicalized یش ناو دەبرێت، زاراوەی کپی (بێ ژێی) voiceless بەرامبەری دەوەستێت. |
| voiced alveolar fricative | احتكاكي لثوي مجهور | **خشۆکی پووکی گڕ( دەنگ ):**<br>وەکو /ز/ی گڕ کە بەرامبەر بە / س/ی کپ دەوەستێت. |
| voiced alveolar lateral | جانبي لثوي مجهور | **لایی پووکی گڕ ( دەنگ ):**<br>وەکو /ل/ ی سووك لەوشەی (لێو)دا. |
| voiced alveolar nasal | انفي لثوي مجهور | **لووتی پووکی گڕ( دەنگ ):**<br>وەکو /ن/ ی گڕ لەوشەی (نەرم)دا. |
| voiced alveolar stop | انفجاري لثوي مجهور | **گیری پووکی گڕ:**<br>وەکو /d/ لە ئینگلیزیدا کە /t/ ی کپ بەرامبەری دەوەستێت. |
| voiced alveopalatal affricate | مزجي غاري لثوي مجهور | **تێکەڵاوی پووکە مەلاشویی گڕ:**<br>وەکو /ج/ی گڕ لەوشەی (جوان) کە /چ/ی کپ بەرامبەری دەوەستێت. |
| voiced alveopalatal fricative | احتكاكي غاري لثوي مجهور | **خشۆکی پووکە مەلاشوویی گڕ:**<br>وەکو/ژ/ لەوشەی (نەژاد)دا کە /ش/ی کپ بەرامبەری دەوەستێت. |

| | | |
|---|---|---|
| voieced bilabial nasal | انفي شفتاني مجهور | **لێوی لووتی گڕ:** وەکو / م/. |
| voiced bilabial stop | انفجاري شفتاني مجهور | **گیری لێوی گڕ:** وەکو /ب/ی گڕ کە /پ/ ی کپ بەرامبەری دەوەستێت |
| voiced dental fricative | احتكاكي اسناني مجهور | **خشۆکی ددانی گڕ:** وەکو /ذ/ی گڕ کە دەنگی /ث/ی کپ بەرامبەری دەوەستێت لەزمانی عەرەبیدا. |
| voiced dental stop | انفجاري اسناني مجهور | **گیری ددانی گڕ:** وەکو /د/ی گڕ لە زمانی کوردیدا کە / ت/ی کپ بەرامبەری دەوەستێت. |
| voiced dental velarized stop | انفجاري مطبق اسناني مجهور | **گیری ددانی بە مەلاشووکراوی گڕ:** وەکو /ض/ی گڕ لەوشەی (ضرب)ی عەرەبیدا کە بەرامبەر بە /ط/ی کپ دەوەستێت لەوشەی (طرب)دا. |
| voiced labiodental fricative | احتكاكي اسناني شفوي مجهور | **خشۆکی لێو ددانی گڕ:** وەکو /ڤ/ی گڕ لەوشەی (مرۆڤ) دا کە / ف/ی کپ بەرامبەری دەوەستێت. |
| voiced palatal stop | انفجاري غاري مجهور | **گیری ڕەقە مەلاشوویی گڕ:** وەکو /گ/ی گڕ لەوشەی ( گەنم)دا کە /ك/ی کپ بەرامبەری دەوەستێت. |
| voiced pharyngeal fricative | احتكاكي حلقي مجهور | **خشۆکی گەروویی گڕ:** وەکو /ع/ی گڕ لەوشەی (عازەب) کە بەرامبەر بە /ح/ی کپ دەوەستێت. |
| voiced retroflex | ارتدادي مجهور | **هەڵگەڕاوەی ( چەماوەی ) گڕ:** وەکو /ر/ی ئەمریکی. |

| | | |
|---|---|---|
| voiced sound | صوت مجهور | **دەنگی گڕ:** بریتیە لەو دەنگە زمانییەی کە ژێیەکانی قوڕگی لەگەڵدا دەلەرێتەوە، وەکو/ب، د، گ، ج، ز، ژ، ڤ، /کە دەنگە کپەکانی وەکو /پ، ت، ك، چ، س، ش، ف/ بەرامبەریان دەوەستێت. |
| voiced stop | انفجاري مجهور | **گیری (وەستاوی) گڕ:** وەکو /ب، د ، گ/. لە زمانی کوردیدا. |
| voiced velar fricative | احتكاكي طبقي مجهور | **خشۆکی نەرمە مەلاشوویی گڕ:** وەکو /غ/ی گڕ لەوشەی (غار) دا کە /خ/ی کپ بەرامبەری دەوەستێت. |
| voiced velarized interdental fricative | احتكاكي بيأسناني مطبق مجهور | **خشۆکی نێو ددانی بە مەلاشوکراوی گڕ:** وەکو/ظ/ی گڕ لەوشەی (ظالم)ی عەرەبیدا کە /ص/ی کپی عەرەبی بەرامبەری دەوەستێت. |
| voiced velarized lateral | جانبي مطبق مجهور | **لایی بە مەلاشووکراوی گڕ:** وەکو /ڵ/ ی قەڵەوی گڕ لەوشەی (منداڵ) ی کوردیدا. |
| voiced velar nasal | انفي طبقي مجهور | **لووتی نەرمە مەلاشوویی گڕ:** وەکو/ن/ی گڕ لەوشەی (زەنگ)ی کوردیدا. |
| voiced velar stop | انفجاري طبقي مجهور | **گیری نەرمە مەلاشوویی گڕ:** وەکو /گ/ی گڕ لەوشەی (گەرم)ی کوردیدا کە /ك/ی کپ بەرامبەری دەوەستێت. |
| voiceless | مهموس | **کپ (بێ ژێ):** سیفەتە بۆ ئەو دەنگەی کە ژێیەکانی قوڕگی لەگەڵدا نالەرێتەوە، وەکو /پ، ت، ك، ف، س، ش، ح/ کە سیفەتی گڕی voiced بەرامبەری دەوەستێت. |

| | | |
|---|---|---|
| voiceless alveolar fricative | احتكاكي لثوي مهموس | **خشۆکی پوکی کپ:** وەکـو /س/ی کـپ کـە /ز/ی گـڕ بەرامبـەر دەوەستێت. |
| voiceless alveolar fricative stop | انفجاري لثوي مهموس | **گیری پوکی کپ:** وەکـو /ت/ی کـپ کـە /د/ی گـڕ بەرامبـەری دەوەستێت. |
| voice less alveolar velarized fricative | احتكاكي مطبق لثوي مهموس | **خشۆکی بەمەلاشووکراوی پووکی کپ:** وەکـو [ص] کـە دەبێتـە ئـەلۆفۆنی /س/ لـەزمانی کوردیـدا وەك لەوشـەکانی (سـاڵ، سەگ، سەڵتە، سەد)دا هەیە. |
| voiceless alveopalatal affricate | مزجي غاري لثوي مهموس | **تێکەلاوی پوکە مەلاشوی ڕەقی کپ:** وەکو /چ/ی کپ لەوشـەی (چاو)ی کوردیـدا کە /ج/ی گڕ بەرامبەری دەوەستێت. |
| voiceless alveopalatal fricative | احتكاكي غاري لثوي مهموس | **خشۆکی پوکە مەلاشوی ڕەقی کپ:** وەکو /ش/ی کپ لەوشـەی (شـار)دا کـە /ژ/ی گڕ بەرامبەری دەوەستێت. |
| voiceless bilabial stop | انفجاري شفتاني مهموس | **گیری لێوی کپ:** وەکـو /پ/ی کـپ کـە /ب/ی گـڕ بەرامبـەری دەوەستێت. |
| voiceless dental fricative | احتكاكي اسناني مهموس | **خشۆکی ددانی کپ:** وەکـــو/ ث/ی کـــپ لەوشــەی (ثـوم)ی عەرەبیـــدا کـــە /ذ/ی گـــڕ بەرامبـــەری دەوەستێت. |
| voiceless dental stop | انفجاري اسناني مهموس | **گیری ددانی کپ:** وەکـو /ت/ی کـپ کـە /د/ی گـڕ بەرامبـەری دەوەستێت. |

| | | |
|---|---|---|
| voiceless dental velarized stop | انفجاري مطبق اسناني مهموس | **گیری بە مەلاشوکراوی ددانی کپ:** وەکو /ط/ی کپ لەزمانی عەرەبیدا، ئەم دەنگە دەبێتە ئەلۆفۆنی /ت/ لەزمانی کوردیدا وەك لەوشەکانی (تاڵ، سەڵتە)دا هەیە. |
| voiceless glottal fricative | احتكاكي حنجري مهموس | **خشۆکی قورگی کپ:** وەکو /ه/ی کپ لەوشەی (هەور)ی کوردیدا. |
| voiceless glottal stop | انفجاري حنجري مهموس | **گیری قورگی کپ:** وەکو /ئ/ی هەمزەی کپ. |
| voiceless interdental fricative | احتكاكي بيأسناني مهموس | **خشۆکی نێوددانی کپ:** وەکو /ث/ی کپ لەوشەی (ثور)ی عەرەبیدا کە /ذ/ی گڕ بەرامبەر دەوەستێت. |
| voiceless labiodental | احتكاكي اسناني شفوي مهموس | **خشۆکی لێوددانی کپ:** وەکو /ف/ی کپ کە /ڤ/ی گڕ بەرامبەری دەوەستێت. |
| voiceless palatal stop | انفجاري غاري مهموس | **گیری ڕەقە مەلاشویی کپ:** وەکو /ك/ی کپ لەوشەی /کێ/دا، لێرەدا سازگەی دەنگەکە هاتۆتە پێشەوە لەئەنجامی کارتێکردنی ڤاوڵی /ێ/ ئەمەش جیاوازی لەگەڵ /ك/ی وشەی (کۆتر)دا هەیە کە دەنگێکی نەرمە مەلاشوییە. |
| voiceless pharyngeal fricative | احتكاكي حلقي مهموس | **خشۆکی گەروویی کپ:** وەکو /ح/ی کپ لەوشەی (حەوت)دا کە /ع/ی گڕ بەرامبەری دەوەستێت. |

| | | |
|---|---|---|
| voiceless sound | صوت مهموس | **دەنگی کپ:**<br>بڕوانە زاراوەی voiceless. |
| voiceless stop | انفجاري مهموس | **گیری ( وەستاوی ) کپ:**<br>وەکو /ك، ت، پ، ق، ئ،/ لەزمانی کوردیدا. |
| voiceless uvular stop | انفجاري لهوي مهموس | **گیری زمانۆچکەیی کپ:**<br>وەکو /ق/ی کپ لەوشەکانی (قاچ، قوڵ، قڕ)دا هەیە. |
| voiceless velar fricative | احتكاكي طبقي مهموس | **خشۆکی نەرمە مەلاشوویی کپ:**<br>وەکو /خ/ی کپ لەوشەی (خەو)ی کوردیدا کە /غ/ی گڕ بەرامبەری دەوەستێت. |
| voiceless velar stop | انفجاري طبقي مهموس | **گیری نەرمە مەلاشوویی کپ:**<br>وەکو /ك/ی کپ لەوشەی (پاك)ی کوردیدا کە /گ/ی گڕ بەرامبەری دەوەستێت. |
| voiceless vowel | صائت مهموس | **ڤاوڵی کپ:**<br>ئەو ڤاوڵەی کە کپ دەبێت بەپێچەوانەی ڕەفتاری ئاسایی خۆی کە دەنگێکی گڕە بەهۆی دەرکەوتنی لەنێوان دوو دەنگی کۆنسەنەنتی کپدا، وەکو /ی/ لەوشەی (تیپ)دا. |
| voice qualifier | واصف الصوت | **دەنگ وەسفکەر:**<br>ئەو سیفەتەی لەگەڵ ئاخاوتندا دەردەکەوێت و باری دەروونی قسەکەر نیشان دەدات وەکو خەم و خۆشی و پەشیمانی و پاڕانەوەو تکاکردن. |
| voice quality | نوعية الصوت | **جۆری ( شێوەی ) دەنگ:**<br>ئەو سیمایەی کە شێوەی یان جۆری دەنگ نیشان دەدات. |

| | | |
|---|---|---|
| voicing | اجهار | **بەگڕکردن:**<br>بریتیــە لەدرکانــدنی دەنگــی کــپ بــەگڕ لەئاکامی کارتێکردنی ئەو ژینگە دەنگییەی کە تێیدا دەردەکەوێت، وەکو: لێت دەدەم > لێـد دەدەم، ئەمــەش بەرامبــەر بــەکپ بــوون دەوەســتێت، واتــە درکانــدنی دەنگــی گــڕ بــە کپ. |
| volume | حجم الصوت | **قەبارەی دەنگ:**<br>بڕوانە زاراوەی loudness . |
| vowel | صائت | **ڤاوڵ (بزوێن):**<br>بریتیـــــە لــــــەدەنگێکی زرینگـــــــەداری درێژەپێـدەری گـڕ، لـەکاتی دروسـت بـوونی ڤاوڵەکانـدا تـەزووی هەناسـە بـەبێ تەگـەرە دێتە دەرەوەو دەبێتە ناوکی ئەو بڕگەیەی کە پێکی دەهێنێ‌و هێـزی بڕگەکەشـی دەکەوێتـە سەر، ڤاوڵیش لـەڕووی سازگەوە سـێ جۆرە پێشـەوەو ناوەڕاسـت و پشـتەوە، هـەروەها بەرزو ناوەندی‌و نزمی هەیە، دیسانەوە ڤاوڵ یـان کورتـە یـان درێـژە یـان سـادەیە یـان لێکدراوە یان یەك لانەیە یان دوولانەیە یان سێ لانەیە یان خڕە یان نـاخڕە. لە ڕاستیدا دەنگی ڤاوڵ جیاوازی لەگەڵ نیمچە ڤاوڵ دا هەیـەو بەرامبـەر بـە دەنگـی کۆنسـنەنتیش دەوەستێت. |
| vowel cluster | عنقود صائت | **هێشووە ڤاوڵ:**<br>بریتیـە لەکۆمەڵـە ڤـاوڵێکی بـەرەو دوای یـەك یــان ڤاوڵێــك لەگــەڵ نیمچــە ڤاوڵێکــدا لــە |

| | | |
|---|---|---|
| | | برگەیەکدا بەسەریەکەوە دەربکەون. |
| voweled writing | كتابة مشكولة | **نووسینی سەرو بۆردار:**<br>ئەو جۆرە نووسینەیە کە سەرو بۆری تێدا بەکار دەهێنرێت بەرامبەر بە ڤاوڵە کورتەکان، وەکو لەنووسینی زمانی عەرەبیدا بەدی دەکرێت. |
| vowel fracture | انكسار الصائت | **شکانی ڤاوڵ:**<br>بریتیە لە گۆڕانی ڤاوڵێکی سادە بۆ ڤاوڵێکی لێکدراو لە ژێر کاریگەری دەنگێک یان چەند دەنگێکی دەوروبەر. |
| vowel gradation | ابدال الصائت | **گۆڕانی ڤاوڵ:**<br>بریتیە لە گۆڕانی ڤاوڵێک لەناو وشەیەکدا، کە دەبێتە هۆی گۆڕانی واتا، وەکو شار: شیر، دار: دەر، هەروەها بەزاراوەی ablaut یان apophonyیش ناودەبرێت. |
| vowel harmony | توافق الصوائت | **گونجانی (ڕێك بوونی) ڤاوڵەکان:**<br>بریتیە لەگونجانی ڤاوڵەکانی وشەیەك لەسیفەتێك لەسیفەتەکانی ڤاوڵ، وەك ئەوەی هەموویان لەڤاوڵەکانی پێشەوە بن یان لەڤاوڵەکانی دواوە بن، ئەم دیاردەیەش لەزمانە ئۆڕالییەکاندا ڕوودەدات، ئەمەش بەجۆرێك لەگونجانی نادەوروبەر دادەنرێت، کە ڤاوڵەکە دەگۆڕێت بۆ ئەوەی لەڤاوڵێکی تر بچێت لەبرگەی پێش یان پاش خۆیەوە. |
| vowel lengthening | اطالة الصائت | **درێژکردنی ڤاوڵ:**<br>بریتیە لە زیادکردنی سیفەتی درێژی لە ڤاوڵێکدا. |

| | | |
|---|---|---|
| vowel phoneme | فونيم صائت | **فۆنیمی ڤاوڵ:**<br>بڕوانە زاراوەی vowel. |
| vowel quadrilateral | رباعي الصوائت | **ڤاوڵی چوارلا ( چوار گۆشە ):**<br>بریتییە، لەشێوەیەکی چوار لایی کە ڤاوڵەکانی تێدا نیشان دەدرێت بەپێی شوێنەکانی زمان لەناو زاردا لەکاتی درکاندنی ئەو ڤاوڵانەدا. |
| vowel quality | نوعية الصائت | **جۆری ڤاوڵ:**<br>بریتییە لەو ئاکارانەی (سیفاتانەی) کە کار دەکەنە سەر ڤاوڵ وەکو شوێنی زمان و بەرزی و نزمی لەناو زاردا لەگەڵ ڕادەی (ماوەی) کرانەوەی زار و پلەی خڕبوونی لێوەکان. |
| vowel quantity | كمية الصائت<br>طول الصائت | بۆ دوو مەبەست بەکار دێت:<br>١-چەندێتی ڤاوڵ<br>٢-درێژی ڤاوڵ |
| vowel reduction | تقصير الصائت | **کورت کردنەوەی ڤاوڵ:**<br>بریتییە لە کەم کردنەوەی درێژی ڤاوڵ بەهۆی ئەو ژینگە دەنگییەی کە تێیدا دەردەکەوێت، وەکو کورت کردنەوەی /وو/ی درێژ لەوشەی (دوو) دا بۆ /و/ی کورت لەوشەی (دووەم) دا. |
| vowel system | نظام الصوائت | **سیستەمی ڤاوڵەکان:**<br>بریتییە لەو سیستەمەی کە حوکم دەکاتە سەر ڤاوڵەکانی زمانێک لەڕووی ژمارەی ڤاوڵەکانی و ئاکارەکانیان و |

| | | |
|---|---|---|
| | | پەیوەندییـــــەکانیان و دابەشـــــبوونیان و ئەلۆفۆنەکانیانـــەوە، هــــەر زمـــانێکیش سیستەمێکی تایبەتی خۆی هەیە. |
| vowel triangle | مثلث الصوائت | **سێ گۆشەی ڤاوڵی:** بریتیە لەشێوەیەکی سێ گۆشەیی، هـەردوو زمانـەوان سمیـث smithو تراگـەر Trager وێنـەیان کێشـاوە کـە ڤاوڵـەکانی زمـانی ئینگلیزییـان تێـدا دیـاری کـردووە بـەپێی شـــوێنەکانی زمـــان لـــەناو زاردا لـــەکاتی دەرکاندنی ئەو ڤاوڵانەدا. |

# - W -

| | | |
|---|---|---|
| weakening | تخفيف | **سوك كردن :**<br>بريتيه لەكەم كردنەوەی ئەركی ماسولكەيی لــــەكاتی دركانـــــدنی كۆنســـــنەنتەكاندا بەمەبەســـتی وزە پاراســـتن، وەك گـــۆڕينی دەنگـــی /ط/ی بـــە مەلاشـــوكراو بـــۆ /ت/ی پـووكی هاوشـێوەی، ئـەم دياردەيـە بـەزۆری لـەو وشـانەدا بـەدی دەكرێـت كـە لـەزمانی عەرەبييەو هاتونەتە ناو زمانی كوردی، وەك (طاهر- تاهير). |
| weak letter | حرف العلة | **پيتی ڤاول ( بزوێن ):**<br>ئەو پيتەيە كە وەكو هێما بۆ ڤاول بەكاردێت لەنووسينی ئاساييدا. |
| weak phoneme | فونيم ضعيف ( لين ) | **فۆنيمی لاواز ( نەرم ):**<br>بڕوانە زاراوەی lax phoneme. |
| weak stress | نبرة ضعيفة | **هێزی لاواز:**<br>فۆنيمێكی ناكەرتييــە هێماكـەی بەم جۆرەيە /ˇ/، ئەمــەش بــە لاوازتــرين پلــەكانی هێــز دادەنرێــت، ئـــەم جـــۆرە هێـــزەش بـــەزۆری دەكەوێتە سـەر وشـە ئەركييـەكانی زمـان وەك ئامرازەكانی بەستنەوەو پريپۆزيشن. |
| whisper | وشوشة | **وەش وەشە :**<br>ئـەو جـۆرە دركاندنەيـە كـە ژێيـەكانی قوڕگی تێدا نزيك دەبێتەوە لەو بارەی كە لەحاڵـەتی گرِيـدا هەيـەتی لەگـەڵ ڕەق بـوونی ژێيەكانـدا بـۆ ئـــەوەی لـــەكاتی تێپـــەربوونی تـــەزووی هەناسەدا لەرينەوە ڕوونەدات. |

| | | |
|---|---|---|
| whispered sound | صوت موشوش | **دەنگی وەش وەشەدار:**<br>بڕوانە زاراوەی پێشوو. |
| whistling consonant | صامت صفري | **کۆنسەنەنتی فیکەیی:**<br>بڕوانە زاراوەی sibilant |
| wide diphthong | ثنصائت واسع | **ڤاوڵی دوولانەی فراوان (کراوە):**<br>ئەو ڤاوڵە دوولانەیەیە کە لەکاتی درکاندنی هەردوو بەشەکەی (لایەنەکەی) هەست بە گۆڕانی شوێنی زمان دەکرێت وەکو /aw/ لەوشەی (how)ی ئینگلیزیدا. |
| wind pipe | القصبة الهوائية | **بۆری هەناسە:**<br>بڕوانە زاراوەی trachea . |
| word stress | نبرة الكلمة | **هێزی وشە:**<br>بریتیە لەو هێزە سەرەکییەی کە دەکەوێتە سەر یەکێك لەبڕگەکانی وشە کاتێ کە وشەکە بەتەنیاو لەدەرەوەی ڕستەدا دەدرکێت، ئەمەش جیاوازی لەگەڵ هێزی ڕستەدا هەیە کە یەکێك لەوشەکانی ڕستە هێزەکە وەردەگرێت. |
| writing | كتابة | **نووسین:**<br>دربڕینی دیوی دووەمی زمانە، لەکاتێکدا ئاخاوتن بەدیوی سەرەکی دەربڕینی زمان دادەنرێت، نووسینیش چەند جۆرێکی هەیە، وەك نووسینی ئاسایی و نووسینی دەنگی و نووسینی فۆنیمی، کاتێك نووسین نموونەیی دەبێت ئەگەر بێتو بەرامبەر بەهەر فۆنیمێك پیتێك دابنرێت، هەندێ جۆری نووسین ناتەواو دەبێت وەك ئەوەی بەرامبەر بەڤاوڵە |

| | | |
|---|---|---|
| | | کورتـــەکان پیـــت دانـــەنراوە، دیســـانەوە لەزمانـــەکانی جیهانـــدا چـــەندین جـــۆری نووســـین بەرچـاو دەکـەوێت وەك نووســـینی بڕگەیی و نووسینی وشەیی و نووسینی بیری کە هێماکانی بیرێك دەردەبڕن. |
| writing system | نظام الكتابة | **سیستەمی نووسین:** سیستـەمێکی هێمـایی نووسـینە کـە زمانێـك پابەندی دەبێت بەو شێوەیەی کە زمانەکەی پێ دەنووسرێت. |

| ســا - ئــه | | |
|---|---|---|
| Normal speech | كلام عادي | ئاخاوتنی ئاسایی |
| Intonationless speech | كلام غير تنغيمي | ئاخاوتنی بیٚ ئاوازه |
| Mono tone speech | كلام رتيب | ئاخاوتنی ریٚك و پیٚك |
| Internal speech endo phasia | كلام داخلي | ئاخاوتنی ناوەوە |
| Economy tendency | الميل الى الاقتصاد | ئارەزووی کەم کردنەوە |
| Pronounce ability | سهولة التلفظ | ئاسانی گۆکردن |
| Level | مستوى | ئاست |
| Pitch level | مستوى النغم | ئاستی ئاوازە |
| Metathesis | تبادل خاطئ | ئاڵوگۆڕ کردنی بەهەڵە |
| On-glide<br>Onset | تهيؤ | ئامادەبوون |
| Phonemic set | استعداد فونيمي | ئامادەیی فۆنیمی |
| Tape recorder | جهاز تسجيل | ئامێری تۆمار کردن |
| Segmentater | جهاز التقطع | ئامێری کەرت کردن |
| Speech stretcher | جهاز تبطئ الكلام | ئامێری کەم کردنی خێرایی ئاخاوتن |
| Melody | لحن ( ايقاع ) | ئاواز (تریە) |
| Intonation | تنغيم | ئاوازە |
| Pitch | نغم ( درجة الصوت ) | ئاوازە (پلەی دەنگ) |
| High pitch | نغم عال | ئاوازەی بەرز |
| Mono tone | نغمة وترية | ئاوازەی تیرەیی (وەتەری) |
| Pure tone | نغمة نقية | ئاوازەی خاوێن |
| Level intonation | تنغيم مستو | ئاوازەی ریٚك(یەك ئاست) |
| Exclamatory pitch | نغم التعجب | ئاوازەی سەر سورمان |
| Fundamental note<br>Fundamental tone | نغمة اساسية | ئاوازەی سەرەکی |
| Extra high pitch | النغم فوق العالي | ئاوازەی سەرووی بەرز |
| Harmonic | نغمة توافقية | ئاوازەی گونجاو |

| | | |
|---|---|---|
| | | (هارمۆنی) |
| Mid pitch | نغم متوسط | ئاوازەی ناوەندی |
| Low pitch | نغم منخفض | ئاوازەی نزم |
| Pause-pitch | نغم الوقف | ئاوازی وەستان |
| Functional load | عبء وظيفي | ئەرکی لە ئەستۆ گرتن |
| Acrology<br>Acrophony | كتابة صوتية اوائلية | ئەکرۆفۆنی (نوسینی سەرەتایی دەنگ) |
| Allochrone | الوكرون، متغير زمني | ئەلۆکرۆن |
| Allograph | الوغراف، متغير حرفي | ئەلۆگراف (شێوەی نووسینی پیت) |
| Allophone | الوفون، متغير صوتي | ئەلۆفۆن (شێوەی درکاندنی دەنگ) |
| Alphabet | الألفبا | ئەلفوبێ |
| Traditional orthography | تهجئة تقليدية | ئەلفوبێی (هجائی) کۆن |
| Syllabary | ابجدية مقطعية | ئەلفوبێی برگەیی |
| Manual alphabet | ابجدية يدوية | ئەلفوبێی دەستی |
| Phonemic alphabet | ابجدية الصوتية | ئەلفوبێی دەنگی |
| IPA=international phonetic Association | الابجدية الصوتية الدولية | ئەلفوبێی دەنگی جیهانی |
| Latin alphabet | الابجدية اللاتينية | ئەلفوبێی لاتینی |
| Perfect alphabet<br>Ideal alphabet<br>Phonetic alphabet | ابجدية مثالية | ئەلفوبێی نموونەیی |
| Organs of speech | اعضاء الكلام (النطق) | ئەندامانی ئاخاوتن (درکاندن) |
| Iconograph | ايقنة | ئەیکون |
| | - ب - | |
| Parches mind pipe<br>Windpipe | القصبة الهوائية | بۆری هەناسە |
| Cavity=chamber | تجويف | بۆشایی |
| Buccal cavity<br>Oral cavity | التجويف الفمي | بۆشایی زار |

| | | |
|---|---|---|
| Resonace chamber | تجويف الرنين | بۆشایی زرینگان |
| Head cavity | تجويف رأسي | بۆشایی سەر |
| Supraglottal cavity | تجويف فوق حنجري | بۆشایی سەروی قورگ |
| Passive cavity | تجويف سلبي | بۆشایی سەلبی |
| Pulmonic cavity | تجويف رئوي | بۆشایی سییەکان |
| Active cavity | تجويف نشيط | بۆشایی چالاك |
| Pharyngeal cavity | التجويف الحلقي | بۆشایی گەروو |
| Nasal cavity | التجويف الانفي | بۆشایی لووت |
| Air chamber | تجويف هوائي | بۆشایی هەوا |
| Vocalism | التحويل الى صائت | بە ڤاوڵ کردن |
| Consonantization | التحويل الى صامت | بە کۆنستەنت کردن |
| Latinization | تلتين | بە لاتینی کردن |
| Velarized | مطبق | بە مەلآشووکراوی نەرم |
| Sound sequence | متتالية صوتية | بەدوا یەك هاتنی دەنگ |
| Actualization | تحقيق الصوت | بەدی هێنانی دەنگ |
| Velarization | اطباق، تفخيم | بەر مەلآشوو دانی نەرم |
| Non-palatalized | غير مغور | بەر مەلآشوو نەدراو |
| Contrast<br>Opposition | تقابل | بەرامبەر |
| Phonemic opposition<br>Phonemic contrast | تقابل فونيمي | بەرامبەر بوونی فۆنیمی |
| Stress contrast | تقابل النبرات | بەرامبەر بوونی هێزەکان |
| Medial contrast | تقابل وسطي | بەرامبەر ی ناوەندی |
| Paradigmatic contrast<br>Paradigmatic | تقابل راسي | بەرامبەری |
| Contrastive pair | ثنائي التقابل | بەرامبەری دوو لایی |
| Proportional opposition | تقابل تناسبي | بەرامبەری رێژەیی |
| Initial contrast | تقابل استهلالي | بەرامبەری سەرەتایی |
| Final contrast | تقابل ختامي | بەرامبەری کۆتایی |
| Continuant | امتدادي | بەردەوامی (دەنگ) |
| Frictionless continuant<br>Open approximant | امتدادي غير احتكاكي | بەردەوامی ناخشۆکی |

| | | |
|---|---|---|
| Frictionless | | |
| Prominence | علو (بروز) | بەرز بوون (دەرکەوتن) |
| Maximum closure | انغلاق اقصى | بەرزترین پلەی داخستن |
| Palatalized=soft | مغور | بەرمەلاشودراوی ڕەق |
| Palatalization<br>Softening | تغوير | بەرمەلاشوو دانی ڕەق |
| Phonation | تصويت | بەگڕ کردن |
| Vocalization<br>Voicing | اجهار | بەگڕ کردن |
| Nasalization | تانيف (انفمية) | بەلووت کردن (لووتە زاری) |
| Non-nasalized | غير مؤنف | بەلووت نەکراو |
| Labialization<br>Latinization | تشفية ، مشفة | بەلێوکراو |
| Labialized | يشفه | بەلێوکردن |
| Unreleased | محبوس | بەند کراو (گیربوون) |
| Glottalized | مهموز | بەهەمزە کراو |
| Glottalization | اهماز | بەهەمزە کردن |
| Stressed | منبور | بەهێز بوون |
| Syllable | مقطع | برگە |
| Syllabation | تقطع | برگە کردن |
| Free stress | مقطع حر | برگەی ئازاد |
| Stressed syllable | مقطع منبور | برگەی بەهێز بوو |
| Atonic<br>Unstressed syllable | مقطع غير منبور | برگەی بێ هێز (لاواز) |
| penultimate syllable | المقطع قبل الاخير | برگەی پێش کۆتایی |
| Closed syllable<br>Blacked syllable<br>Checked syllable | مقطع مغلق | برگەی داخراو |
| Light syllable | مقطع خفيف | برگەی سووك |
| Bridge syllable | مقطع وصلي | برگەی گەیەنەر |
| Eme principle | مبدأ الأيم ( الوحدات المجردة ) | بنەمای ئیمی ( یەکەی ڕووت) |

| | | |
|---|---|---|
| Mouth roof<br>Roof of the mouth | سقف الفم( الحنك ) | بنميچی زار (مەلاَ شوو) |
| Neutralization | تحييد | بیْ لایەن |
| Audible | مسموع | بیستراو |
| - ت - | | |
| Stenosonograph | كاتبة الأصوات | تۆمارکەری دەنگەکان |
| Toneme | تونيم نغمي | تۆنیم |
| Coronal | اكليلي | تاجی (دەنگ) |
| Language laboratory | مختبر اللغة | تاقیگەی زمان |
| Vocal bands | الاوتار الصوتية | تاله باریکەکانی قورگ |
| Breath stream | تيار النفس | تەزووی هەناسە |
| Strcture | تضيق | تەسك بوون |
| Auditory masking | تشويش سمعي | تەشویشی بیستن |
| Noise | اعاقة | تەگەرە |
| Plosion=explosion | انفجار | تەقین (گیر) |
| Plosive=stop | انفجاري | تەقیو=گیر (دەنگ) |
| Resonator | جسم رنان | تەنی زرینگاو |
| Cadence<br>Harmony<br>Rhythm | ايقاع،تناغم | تریە |
| Rhythmic | ايقاعي | تریەدار (رتمدار) |
| Syllable timed | ايقاع مقطعي | تریەی برگەیی |
| Stress-timed tythem | ايقاع نبري | تریەی هێزدار |
| Tilde=til | تلدة | تلدە |
| Glossolalia | قدرة لسانية | توانای زمانی |
| Medium-transferability | قابلية التحويل | توانای گواستنەوە |
| Anthropophonics | الامكانية الصوتية البشرية | تونای دەنگی مرۆۆ |
| Intensity of aspiration | شدة الهائية ( النفسية ) | توندی هائیەت(هەناسەیی) |
| Intensity | شدة | توندی(هێز) |

| | | |
|---|---|---|
| Phonemic field work | بحث ميداني فونيمي | توێژینەوەی مەیدانی فۆنیمی |
| Affrication | مزج | تێکەڵ |
| Merger | اندماج | تێکەڵ بوون |
| Crasis<br>Diphthongization | ادغام الصوائت | تێکەڵ بوونی ڤاڵەکان |
| Affricate | مزجي( شبه انفجاري ) | تێکەلاو (نیمچەگیر) |
| Voiceless alveopalatal fricative | مزجي غاري لثوي مهموس | تێکەلاوی پوکە مەلاشووی ڕەقی کپ |
| Voiced alveopalatal affricate | مزجي غارى لثوي مجهور | تێکەلاوی پووکە مەلاشووی گڕ |
| Assibilant | مزجي اسناني | تێکەلاوی ددانی |
| Fronto-palatal affricate | مزجي غاري امامي | تێکەلاوی مەلاشووی ڕەقی پێشەوە |
| - پ - | | |
| Post-palatal | خلفي غاري | پاش مەلاشووی ڕەق |
| Post-velar | خلفي طبقي | پاش مەلاشووی نەرم |
| Dorsal<br>Dorso | خلفي | پاشەوە (دواوە) |
| Post-oral | خلفي فمي | پاشەوەی زار |
| Post-alveolar | بعدي لثوي | پاش-پووکی |
| Post-dental | خلفي اسناني | پاش-ددانی |
| Post junctural | بعدي فاصلي | پاش-هەڵوەستە |
| Phonemic evolution | تطور صوتي | پەرەسەندنی دەنگی |
| Correlation | ارتباط | پەیوەندی |
| Amplification | متعلق بالتضخيم | پەیوەندی بە قەڵەو بوون هەیە |
| Back of the tongue<br>Dorsum | مؤخر اللسان | پشتەوەی زمان |
| Release | استراحة | پشوودان |
| Opening degree | درجة الانفتاح | پلەی کرانەوە |

| | | |
|---|---|---|
| Alveola<br>Alveolar ridge<br>Gum | اللثة ، السنخ | پووك |
| Palato-alveolar<br>Alveo palatal | لثوي غاري | پووكە مەلاشوویی ڕەق |
| Alveolar<br>Gingival | لثوي | پووكی (دەنگ) |
| Supradental | لثوي ، فوق اسناني | پووكی ، سەرووی دانەكان |
| Lamino-alveolar | لثوي أمامي | پووكی پێشەوە |
| Apico-alveolar | لثوي ذلقي | پووكی نوكە زمانی |
| Dorso-alveolar | لثوي خلفي | پووكی–پاشەوە |
| Graph<br>Letter | حرف | پیت |
| Lower-case letter<br>Small letter | حرف صغير | پیتی بچووك |
| Silent letter | حرف غير ملفوظ | پیتی گۆنەكراو |
| Weak letter | حرف العلة | پیتی ڤاوڵ ( بزوێن) |
| Polyphone | حرف متعدد الاصوات | پیتی فرە دەنگ |
| Dark letter | حرف مفخم | پیتی قەڵەو |
| Mute | حرف ساكن | پیتی كۆنستەنت |
| Dead letter | حرف غير منطوق | پیتی نەدركاو |
| Tongue<br>advancement | تقديم اللسان | پێش خستنی زمان |
| Pre-dental | قبل أسناني | پێش ددانی |
| Pre-palatal | قبل غاري | پێش مەلاشووی ڕەق |
| Pre-velar | قبل طبقي | پێش مەلاشووی نەرم |
| Frontal=laminal<br>Antevior=diffuse | امامي( متقدم في محزجة ) | پێشەوە (پێشكەوتوو لە سازگەدا) |
| Tongue front<br>Blade of the tongue<br>Front of the tongue | مقدم اللسان | پێشەوەی زمان |
| Fronting | تقدم | پێشش خستن |
| Advanced<br>Fronted | مقدم | پێشكەوتوو(دەنگ) |

